# کەلەپووری کوردی

کۆ کردنەوەی:

محەممەد عارف مودەڕڕیسی

کتێب فرۆشی شێخی

سنە

# کەلەپووری کوردی


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | کەلەپووری کوردی |
| ✓ کۆ کردنەوەی: (گردآوری) | محەممەد عارفی مودەڕریسی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول): ۱۳۸۴ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۲۰۰۰ دانە (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۲۲۴ صفحەی وزیری |
| ✓ بلاوکەرەوە (ناشر): | کتێب فرۆشی شێخی (کتابفروشی شیخی) |


نرخی:

**۲۲۰۰ تمەنە**


**ناوەندی بڵاو کردنەوە :**

**کتێب فرۆشی شێخی، تەلەفون: ٢٢٥٤١٥٢**

# پێڕست


سوپاس و پێ زانین ........ الف
پێشەکی ........ ب
بەشی یەکەم ( پەندی پێشینان)
پیتی (ئەلف) ........ ٥
پیتی (ب) ........ ١٢
پیتی (پ) ........ ٢٠
پیتی (ت) ........ ٢٥
پیتی (ج) ........ ٣٣
پیتی (چ) ........ ٣٦
پیتی (ح) ........ ٣٩
پیتی (خ) ........ ٤١
پیتی (د) ........ ٥١
پیتی (ر) ........ ٦٢
پیتی (ز) ........ ٦٨
پیتی (ژ) ........ ٧٢
پیتی (س) ........ ٧٦
پیتی (ش) ........ ٧٩
پیتی (ع) ........ ٨٥
پیتی (غ) ........ ٨٩
پیتی (ف) ........ ٩٠
پیتی (ق) ........ ٩١
پیتی (ك) ........ ٩٧
پیتی (گ) ........ ١٠٩
پیتی (ل) ........ ١١٥

پیتی (م) .................................... ١٢٤
پیتی (ن) .................................... ١٣٦
پیتی (و) .................................... ١٤٤
پیتی (ه) .................................... ١٥٠
پیتی (ی) .................................... ١٥٨
بەشی دووهەم
دەوای پێشینانی خۆمان .................................... ١٦٢
بەشی سێهەم
سروودی نەورۆز .................................... ١٦٦
بەشی چوارەم
چوار وەرزی ساڵ و دوانزە مانگە .................................... ١٦٨
بەشی پێنجەم
کات و ساتی نوێژ .................................... ١٧٢
بەشی شەشەم:
ڕێ پێوان لە ڕێی خوادا.................................... ١٧٥
بەشی حەوتەم:
باس و بابەتی جۆر بە جۆر .................................... ١٧٧
دەرخستنی دەرد و بەڵای تریاك .................................... ١٧٨
ڕۆژوو دەوای نەخۆشی بەدەنە و هۆی ڕەزای خوایە .................................... ١٧٩
سکاڵای دێهاتی .................................... ١٨٠
سکاڵای مناڵە عازەبەکانمان لەکوڕو لەکچ .................................... ١٨٢
سکاڵا بۆ دەربەدەری کورد و ناکۆکی بەینی خۆیان .................................... ١٨٣
ناسینی هەورامی .................................... ١٨٥
موناجاتی مەلا ئەبووبەکری چۆڕی .................................... ١٨٦
دەستووری مردوو بەڕێ کردن بۆ قەبر .................................... ١٨٧
سکاڵا بۆ بەدحاڵی مەلا .................................... ١٩٠

# بەناوی خوای میری مەزن

سوپاس و پیٚزانین

به پێویستی ئەزانم سوپاس و پیٚزانینی خۆم ئاراستەی ئە و کەسانە بکەم کە لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی ئەم کتێبەدا ئامۆژگارییان کردووم و یارمەتیان داوم و بە هانامەوە هاتوون، بە تایبەت ئەم حەوت کەسەی خوارەوە:

- ✓ یەکەم: گەورە و ڕێزدار جەنابی «مەلامحەممەدی خوداجوو» کوڕی خوا لیٚخۆشبوو «مەلامحەممەد ئەمینی ئەسپەریٚزی» ناسراو بە «باشماخی».
- ✓ دووهەم: برای زۆر بەڕێزو خۆشەویست کاك «عیسای ئەحمەدزادە» کوڕی «مەلامحەممەد صادق نگلٚی».
- ✓ سیٚهەم: هاوسەرو هاوڕێی هەر دوو دنیام، «حاجیە ڕوقیە خاتوونی دادگوستەر» کچی «مامۆستا مەلامحەممەد ئەمینی دەرەمەڕی» کە یارمەتی داوم لە ڕێكخستنی پەندەکاندا، بە تایبەت پەندە هەورامییەکان.
- ✓ چوارەم: جەنابی کاك «حیرەت سەجادی» کوڕی «رکن الاسلام» لە شاری سنە.
- ✓ پیٚنجەم: کاك «حبیب الله ئاریانژاد» کە لە بیٚهداشتی مەریواندا زەحمەت ئەکیٚشیٚ و لە ویرایشدا هاوکاری کردووە.
- ✓ شەشەم: کاك «ڕەزا پیٚنجوێنی» خاوەنی کامپیوتەری «زەڕنگار»ی مەریوان کە لە کاتی پیت‌چنیندا زۆربەی هەڵەکانی ڕاست کردۆتەوە.

✓ حەوتەم: کاك «ئاری عەبدی» کە زەحمەتی پێدا چوونەوەی ئەم کتێبەی کێشاو بە جوانی ڕازاندیەوە.

✓ هەشتەم: سوپاسی مەلا «ڕەفیق ڕۆستەمی» ئەکەم کە پێدا چوونەوەی کۆتاییەکەی بە ئەستۆگرت و هەڵەکانی بژار کردو وشە کوردییەکان و پەندە هەورامییەکانی ڕاست کردەوەو ئەوەی کە پێویست بوو لای بردو ئەوەیش کە بە باشی ئەزانی پێی زیاد کردو بە ڕێك و پێکی ئامادەی چاپی کرد.

خوا جەزای هەموویان بداتەوە.

***

بە سوپاسەوە

براتان/ عارف مودەڕڕیسی

١٣٨٥/٣/٢٠ کۆچی هەتاوی ٢٧٠٦/٣/٢٠ کوردی

# بِسمِ اللّه الرّحمنِ الرّحیم

## سەرەتا

حەمد و سەنا بۆ یەزدان
هەتا ماوم فەراوان

درووود بۆ پێغەمبەران
لە بۆ هەموو ڕەهبەران

تایبەت پێغەمبەر خۆمان
ئال و ئومەت و یاران

***

گەنجینەی کوردان، پەدی پێشینیان
بۆ پیرو لاوو منالّ و وردان

پەندی پێشینیان بگرینە گوێمان
با لە دیوارا نووسرابیٚ بۆمان

قسەی نەستەق و پەندی پێشینیان
باشترە بۆمان لە ئاوو لە نان

پەندی پێشینیان، گەنجینەی کوردە
هەر یەکە، دەنگی زانایێ کوردە

پەندی پێشینیان جێماوە بۆمان
میرات خۆمانەو بیبەین بۆ خۆمان

من نەمنووسیوە، هەر کۆم کردوەتۆ
زویر مەبە لیٚم، هەروا لە خۆتۆ

ئەگەر بۆ ناوو شۆرەتم پرسی
«محەممەد عارف»،هۆز«مودەڕڕیسی»

هەزارو سێسەدو حەفتاو حەوت شەمسی
زۆر بە دلّ گەرمی ئەمانەم نووسی

***

پێشەکی ڕێزو سلاّووم هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم کتێبە ئەخوێننەوەو بە وردی و بە چاوی ڕەخنەوە لیٚی ئەڕوانن و بە سەرنجەوە موتالاّی ئەکەن.

داوایشیان لیٚ ئەکەم کە ڕەخنەو تێبینم سەبارەت بەم کتێبە، بۆ بنێرن، کە ئەمەش ئەبێتە مایەی دڵ گەرمیو خۆشحاڵی ئەم برایەتان. هیوادارم لە کاتی خوێندنەوەدا ئەم خاڵانەی خوارەوەتان لە بەرچاو بێت:

١- لە هەموو هەڵەکانی ئاگادارم بکەنەوە.

٢- بە پێی تواناو ویسعەتی خۆتان بە پەندی پێشینیان ڕەفتار بکەن و هەوڵیش بدەن بۆ پەرە پێدان و گەیاندنیان بە هەمووان.

٣- ئەگەر هەر کام لەم پەندانەتان نەبیستووە، مەڵێن وا نیەو فلانی لە خۆیەوە هێناویە و دایتاشیوە، چونکە زۆرێك لەم پەندانە ئیشارەیە بە ئایەتی قورئانی پیرۆز، یان حەدیس و فەرمایشی پیاوەگەورەکانە.

٤- بە پێی ڕێنووسی ئەلف و بێی کوردی، پەندەکانمان نووسیوەتەوە و ژمارەشمان بۆ سەرجەم پەندەکان داناوە.

٥- ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە، ئەوەیە کە پەندی پێشینان هەر ئەمانە نین و بیٚگومان زۆرترن. بە کوردی و بە کورتی من هەر ئەمانەم بۆ کۆکراوەتەوە و نووسیومن، بۆیە دەستەوداوێنی ئەوانە ئەبم کە زۆرتر لەم بابەتەوە ئەزانن و ئەیانخەنە سەر کاغەز با ون نەبن.

٦- ئیمامی شافیعیﷺ هەژدە ساڵی تەواو بە ناو خێڵە عەرەبەکاندا گەڕاوە و دیٚ و شارو دەواری وڵاتە عەرەبییەکانی لە ژێر پیٚ ناوە تاوەکو زانیاری لەسەر داب و نەریت و فەرهەنگ و کەلەپووری عەرەبی، کۆ کردوەتەوە و بە زانیاری باشەوە موتاڵای ئایەت و حەدیسی کردووە و شەرح و تەفسیرو پەراوێزی بۆ نووسیون. جا بۆیە منی کەمتر لە ئەو زاتە

گەورەیەش، بە ڕێگای ئەودا ڕۆیشتووم و ئەوا چوار ساڵە خەریکی کۆ کردنەوەی ئەم پەندانەی بەردەستی ئێوەی ئازیزم و ئەوەش بزانن کە زۆربەیانم لە ئایەت و حەدیس و ئامۆژگاری پیاوەگەورەکان وەرگرتووە.

ناوەڕۆکی ئەم کتێبەشم کردووە بە حەوت بەشەوە:

بەشی یەکەم: پەندی پێشینیان کە بە تەرتیبی ئەلف و بێی کوردی کە ٢٧ پیتە و لە «ئەلف»ەوە دەست پێ ئەکات و بە «ی» کۆتاییان دێت. «ڤـێ» کەمە تەرکمان کردووە.

بەشی دووهەم: هەندێك گوڵ و گیاو ڕووەکی کوردەوارین و بۆ برێك لە نەخۆشیەکان بەکار ئەبرێن. وە بە ئەزموون و تەجروبە دەرکەوتووە کە زۆر بە کەڵك و بەجێن و لە مێژەوە وەك داوو دەرمانی ناوچەکانی کوردەواری ئەناسرێن.

بەشی سێهەم: سروودی نەورۆزی کوردەواری‌یە و پێشکەشە بە کوڕو کاڵ و پیرو منداڵی کوردەواری کە بە دڵی پڕ لە هیواو هومێدەوە ئەچنە بەرەو پیری نەورۆزو بەهارەوە.

بەشی چوارەم: تایبەتە بە چوار وەرزو دوازدە مانگی ساڵ.

بەشی پێنجەم: کات و ساتی نوێژ بە میزانی شەرعی و بە پێی ئەزموون و تەجروبەی پێشینانی خۆمان.

بەشی شەشەم: گرینگی و جۆرەکانی ڕێ پێوان لە ڕێگای خوادا.

بەشی حەوتەم: باس و بابەتی جۆر بە جۆرە.

***

ئەبێ بزانیـن کە گەڕانن بە شـوێن پەنـدی پێشینیاناو خـۆ مانـدو کـردن لەگەڵیاو گوێ ڕاگرتن بۆیـان، عیبـادەتێکی گەورەیـە بـە گـوێرەی ئایـەت و حەدیس. بۆ نـموونە من لێرەدا یەك ئایەت و دوو حەدیس ئەنووسم:

«سا تۆ بە عەبدەکانی من موژدە بدە کە عەبدی من کەسانێکن کە گـوێ بۆ هەموو قسەیەك ئەگرن و بە شوێن چاکەکانیانا ئەڕۆن، ئەوانە خـوا ڕێگـەی بۆلای خۆی پێ پێشان داون و ئەوانە خـاوەن ئـاوەزن» (ئایـەتی ١٩ سـورەی زومەڕ)

حەدیسی یەکەم:

«کەلیمەیەك کە ڕێگەی ڕاست و درووسـت کـاری پـێ بـدۆزیتۆ، گـوم بووی موسوڵمانە؟ حەقی هەیە بە تێکۆشانی باشـەوە بگـەڕێ بـە شـوێنیاو لـە هەرکوێ پەیدای بکاماڵی خۆیەتی و لە هەموو کەسێ زۆرتر حەقی هەیـە بیبـا بۆ خۆی و کەس ناتوانێ لێی بسێنێتۆ» (تاج الاصول، بەرگی ئەووەڵ، لاپەڕەی ٥٦ «کتاب العلم»)

حەدیسی دووهەم:

«دین نەسیحەتە.» (کتێبـی «ریـاض‌الـصّالـحیـن» لاپـەڕەی ٤٩ بابـەتی نەسیحەت، حەدیسی ١٨٣)

واتـە: دیـن ئامۆژگـاری کـردن و مۆجگـاری وەرگرتنـە لـە خـواو لـە پێغەمبەرو لە ئیمامەکان و لە موسوڵمانە ساکارەکان. واتە دین بـەم نەسـیحەتە بەردەوام و بەرقەرار ئەبێ.

«اَبْجَدْ»، «هَوَّز»، «حُطّی»، «کَلَمَنْ»، «سَعْفصْ»، «قَرَشَتْ»، ئـەم شـەش وشـەیە تەفـسیـری خـازن لــە سـوورەی ئەعرافـدا ئایـەتی ٧٧ نووسـیویەتی،

**هەریەکی ناوی شایێ بوون لە یەمەنا کە «كَلَمَنْ» لە زەمانی حەزرەتی شوعەیبا بووەو خەزوورەی حەزرەتی مووسا بووە «دروودی خوایان لە سەر». «ثَخَذْ»، «ضَظّغْ» ئەم دوو کەلیمەیەش بۆم پەیا نەبوون مەعنایان چیە، پەیدا کردنیان لە سەر ئێوەی بەرێز. ئەمانە ٢٨ پیتی ئەبجەدن و پێیان ئەڵێن «حرووفی حیسابی جەمەل» بەم جۆرە:**

| ا | ب | ج | د | ه | و | ز | ح | ط | ئەم نۆدانە ئاحادن، واتە: تاکەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | |
| ی | ك | ل | م | ن | س | ع | ف | ص | ئەم نۆدانە عەشەراتن، واتە: دەییەکان |
| ١٠ | ٢٠ | ٣٠ | ٤٠ | ٥٠ | ٦٠ | ٧٠ | ٨٠ | ٩٠ | |
| ق | ر | ش | ت | ث | خ | ذ | ض | ظ | ئەم نۆدانە میئاتن، واتە: سەدییەکان |
| ١٠٠ | ٢٠٠ | ٣٠٠ | ٤٠٠ | ٥٠٠ | ٦٠٠ | ٧٠٠ | ٨٠٠ | ٩٠٠ | |
| غ | | | | | | | | | بە تەنیا غ ئولوفە، واتە: هەزارەکان |
| ١٠٠٠ | | | | | | | | | |

**ئەم ٢٨ پیتە حروفی ئەلف‌و بێی عەرەبین‌و کەلیماتی عەرەبی لەمانە پێك هاتوون.**

# بەشی یەکەم

## پەندی پێشینان

# پیتی ‹ئەلف›

## پەندی پێشینان

١. ئاخر بەچکە گورگ هەر بە گــورگ ئـەبێ بـــا لـــەگەڵ بــەشەر پەروەردە بووبێ

٢. ئـــاخر تــەمەنــمە و ئــەوەڵ دنیـاری بـــە شـوێن جوانیدا تێر ئەیکەم زاری

٣. ئادەم باوکی هەموومان، کە باوکو دایکـی نـەبوو هیچ سەرت سوورِ نەمێنێ‌کە عیسا باوکی نـەبوو

لە تـەنیا پیـاوێ حــەوا درووس بـوو لـــە تــەنیا ژنــێ عیــسا درووس بــوو

ئەم بـــوونـەوەرە مـــەیـی خــودایــە بـــازێ وەسیلەی زاهـیری تیـــایــە

٤. ئـــارد ئــەتـــەقێنێ و قنگ ئەلەقێنێ.

٥. ئـــاردی ورد لـە ماڵی ساحێبیەوە دێتەدەر.

٦. ئازا ئەو کەسەیە کە لــە کـاتی توورِەییـدا، هۆشـی لـە خـۆی بێـتو نـەی‌قـەومێنێ.

«حەدیسە»

٧. ئـــازار لـــە دارو بـــەرد کـــەوێت بـەشـــەر بـەرگـــەی نـاگــرێت

٨. ئـازاری مـــەدە دڵ قـەوم و عەشـرەت لەبـەر دڵـداری و دڵخۆشــی ئـافرەت

٩. ئازیـــزو کەسـێ پـەی کەسـێ چێـشا هەرکـــەس بـــە تــەمای ئـــازیزو وێــشا

خــودا خودامـــەن کــەی رِۆ مـەبۆوە شـەمـــامەی ئـــازیز کــەرو بــە بـۆوە

لایبە ئەم دونـیـا، بــیخــە ئــەولاوە سـەفـا وا بـەلای ئـــەوە دونـیـــاوە

ئەم سێ شیعرە پێشووە ویردی سەر زوبانی مامۆستا مەلا باقر بووە. خوا پلەو پایـەی لـە بەهەشتا بەرزتر بکاتەوە.

١٠. ئـــاسمان دوورو زەوی سـەخـــت چـی بکـەین لـە بـــەشەر بـــەدبەخت

١١. ئاسمان و رِێسمانە. واتە: هەر لە ناودا نزیکن و لە مانادا زۆر لە یەك دوورن.

١٢. ئاش بەتاڵ ئاشەوان بەتاڵ. هەرچی رِەواجی نەمێنێ، وای پێ ئـەڵێن. سـەبارەت بـەم پەندە داستانێك هەیە کە ئەڵێن: رِۆژێك باڵوڵ بە هارونە رِەشـیدی وت: کـەس ناتوانێـت نوێژی بێ خەیاڵ بکات. هارونە رِەشید وتی: من ئەتوانم. نوێـژی دابەسـت و بـە خـەیاڵ

کەوتە بیری ئاش نانەوە و دۆڕاندی. باڵۆڵێش بە خەیاڵەکەی زانی و وتی: ئاش بەتاڵ ئاشەوان بەتاڵ.

١٤. ئامەیی و ئیقاڵ ڕووی کردە کەسێ لە دایك و باب و باپیرناپرسێ

١٣. ئاش‌پەز کە بوون بە دوو، ئاشەکەیان، یان سوێر ئەبێت، یان بێ خوێ.

١٥. ئاشتی کتك و مشك، پرسەی بەقاڵە دووکان چۆڵ و هۆڵ خاڵی و هەواڵە

١٦. ئاش نانەوە چیە؟ ناکەی و پاکەی و کوناکەی. «کەسێك کاری دژوار بە ئاسان بگرێت، وای پێ ئەڵێن».

١٧. ئاش و ماش بە بەختە، جاری وا هەیە بە ئاسان و جاری واش هەیە بە دژوار دەس ئەکەوێ.

١٨. ئاشەوان و موجەوەر کەهاڵ نوێژن، کەچی ئەسبابی نوێژیشیان ئامادەیە.

١٩. ئاشەوانی، هەر کەس ساڵێك بیکات، ئەبێ حەوت ساڵ موجەوەری مزگەوت بکات تا گوناحی ئەو ساڵەی پاك ببێتەوە.

٢٠. ئاشەولێس مەبە. «واتە: بێ قەناعەت مەبە».

٢١. ئاغا ئەو کەسەیە کە خزمەتگوزاری خەڵکە.

٢٢. ئاغا و مامۆستا سەرکەن بە یەکا تەواو ئاوایی ئەدەن بە یەکا

بە حوکمی شەرع، ئەم بە زۆر بازوو دنیا گشت ئەکەن بە مێشی مازوو

«هەر مازوویەك کونێکی هەیە و لە کونەکەدا مێشێکی بێ زەرەر هەیە، بەو مێشە ئەڵێن مێشی مازوو».

٢٣. ئافتاوە و لەگان حەوت دەس، شام و نەهار هیچ.

٢٤. ئاگای لە خشەی مارو مێروو هەس با غافڵ نەبین یەك نیوە نەفەس

٢٥. ئامان ئامان خانمەکە، دەست ئەسووتێ نان مەکە. «لە خۆشەویستی‌یا بە کچی چکۆلە وا ئەڵێن».

٢٦. ئاو بوێستێ، ئەو ناوێسێ.

٢٧. ئاو بە ئاوەدانیا ئەچێتە خوارەوە. «واتە: تا تێر نەبی ئاو ناخۆیتۆ».

٢٨. ئاو بە نەرمی و دەوام، بەرد کون ئەکات. «تۆیش کۆشا بە».

٢٩. ئاور تا زووتر بچیت بە دەمیەوە، زووتر ئەکوژێتەوە. «شەڕیش هەر وایە».

٣٠. ئاو لیڵ ئەکات و ماسی ئەگرێ. «واتە: خەڵك تێك ئەدات و بەهرە وەرئەگرێ».

٣١. ئەچم بوجێیێ کە کەس نەمناسێ	خۆم هەڵئەکێشم پڕ بە کراسێ

٣٢. ئەر بڕوا ئەکەیت بە منی فەقیر	بە ئەشقی ژنۆ خۆت مەکە زەنیر

٣٣. ئەبێ هەر بمری، بچیتە ژێر خاك	جوابی خۆت بەیتۆ لە خراپ و لە چاك

٣٤. ئاو و ئاور ئامانیان نیە. «هۆشیار خۆت بە مەکەوە بەر هەڵمەتیان».

٣٥. ئاوی بێ لەغاوی خواردوەتۆ.

٣٦. ئای لە دڵەکەی من چەنێ بێعارە	تازە بە تەمای ژنی شووداره

٣٧. ئای لە دڵداری چەندە ستەمە	ئای لە دڵداری چەندە ستەمە
بە گوێی من ئەکەی دڵداری مەکە	دڵ گۆشتە، تووشی خەمباری مەکە

٣٨. ئای لە دەس بەخت و تاڵەی ناخاسم	لە ئەزەڵ کۆتا بڕیا لیباسم
بەڕۆژوو نیم، ژینم هەر واسە	خواردنم خەمە و بەرگم پلاسە

٣٩. ئاوی دوای هەنار، وەسە ژەهری مار. «ئەم واتەیە لە هەورامییەوە وەرگیراوە کە تەواوەکەی ئەمەیە ئەڵێن: ئاوی دماو هەناری پێسەنە ژەهرو ماری، ئاوی دماو ساوێ پێسەنە ماسڕو گاوێ، ئاوی دماو بەیێ پێسەنە ماسڕو مەیێ. (ساو: سێف)».

٤٠. ئۆخەی ئۆخەی خۆشمانە، نان و لەتێ بەشمانە. «یا: نان و کەرە بەشمانە».

٤١. ئۆخەی ئۆخەی گەدایی، جار جار بەکار میایی. «بەکار دێت».

٤٢. ئۆخەی، ئۆخەی ئۆخەی لە خۆم	ئۆخەی، ئۆخەی ئۆخەی لە خۆم

٤٣. ئۆخەی خوا خۆی دارۆغەی ناوێ	عیلمی ڕەسایە و جاسووسی ناوێ

٤٤. ئەچم بۆ پێنجوێن، پێنجم پێ ئەچێ	وادەم بۆ دانای تاقەتت نەچێ

٤٥. ئەچمە باوان خەم کەمۆ کەم، کەچی لەوێ خەم جەم ئەکەم.

٤٦. ئەچمە بەرۆ ئاو ئەمبات، دواوەش ئەچم ئاور ئەمسووتێنێ. «لەم بەینا گیرم کردووە».

٤٧. ئەدات لە ناڵ و ئەدات لە بزماریش. «دوو ڕووە».

٤٨. ئەر ساحێب ماڵی هەر وەکو قاڕوون — ئەر ساحێب عیلمی هەر وەکو قالوون
ئەبێ هەر بمری دنیا جێ بێڵی — بۆ ئەونە بێ‌خەم، بۆ ئەونە وێڵی بیکە

٤٩. ئەر لە ئەجیننە و شەیتان ئەترسی — بە ویردت «آیة الکُرسی»

«نامی»

٥٠. ئەسپ و هێسر لەقە لەیەك نادەن لەبەر ئەوە قەومن.

٥١. ئەسپ پێشکەشی، دەمی ناکرێتۆ.

٥٢. ئەسپێ لەڕ، لە تەوێڵەیە کەر، باشترە.

٥٣. ئەشرەفی چکۆلەیە و قیمەتی زۆرە.

٥٤. عەقڵ لە جووان خاسی باشترە.

٥٥. ئەگەر ئەپرسی حاڵ منی هەژار — دووم کردوە بەسێ، دووی‌تریش بەچوار

٥٦. ئەگەر ئەپرسی لەمن بە ڕاسی — دونیا گەر درۆی زۆرە لە ڕاسی

٥٧. ئەگەر ئەترسی، لە خوا بترسە — کە لەو نەترسی، لە کەس مەترسە

٥٨. ئەگەر ئەتەوێت یەکێکی دۆزەخیت چاو پێ بکەوێت، یەکێك پەیا بکە دانیشتبێت و خەڵك لە بەردەمیا بە پێوە وەستابێتن بۆ تەعزیم. «حەدیسە»

٥٩. ئەگەر ئەتەوێ زوو بە زوو بری — بەی بخۆ بە ناشتاو سێویش بە تێری

٦٠. ئەگەر ئەتەوێ نەکەوێ کۆست — ڕازو نیازت مەڵێ لای دۆست
ئەوڕۆ کە دۆستی خۆشەویس تۆیە — سۆزی دوژمنی سەرسەختی تۆیە

٦١. ئەگەر ببی بە پۆلا — دونیا بدەی بە کۆلا
ئەبێ بڕزی لە خۆلا — لە قەبری چۆڵ و هۆلا

٦٢. ئەگەر بتبێ، دەورت پڕە — با لیباسەکانت چڵکن و شڕە

٦٣. ئەگەر برسیتە پێخۆرت بۆ چەس — ئەگەرخەوت‌دێ، ژوورسەرت بۆچەس

٦٤. ئەگەربەختەکەم چاكو خاس‌ئەبوو — نیشانەی چەپم لەلای ڕاس ئەبوو

٦٥. ئەگەر بێت و تاوانبار بگرن، کەس نیە بێ تاوان بێ و نەیگرن.

٦٦. ئەگەر پشیلە باڵدار بوایەت چۆلەکەی لە دنیا ئەبڕی. ئەگەر کەریش شاخدار

بوایە، کەس نەیئەوێرا نزیکی بکەوێت.

٦٧. ئەگەر تۆ پیاوی بەکەڵك و باشی — خۆت لادە لەوەی نەزان و ناشی

٦٨. ئەگەر تۆ نەبی لە ماڵما سەگ ئەتڕێ بە حاڵما.

٦٩. ئەگەر تۆ یەك مەنی، من دوو مەنم، بێجگە لە ساقی گەردەنم.

٧٠. ئەگەر حەکیمی سەرخۆت دەوا کە — جا ئیتر دەوا بۆ خەڵك پەیا کە

٧١. ئەگەر دۆستەکەت جارێك تۆی خڵەتاند، خودا بیگرێت. ئەگەر بوو بە دووجار خوا خۆت بگرێت.

٧٢. ئەگەر دەوڵەمەند بی، دوژمنیشت هەر دۆستە.

٧٣. ئەگەر ڕێی ڕاستت لە بیر نەماوە — شوێن ڕاسان کەوە، کارت تەواوە

٧٤. ئەگەر سەبر کەی، لە ئاوی لیمۆ، هەڵوا درووست ئەکەی.

٧٥. ئەگەر شووانی ببوایێ بە عەیب — مووسا نەیئەکرد شوانی بۆ شوعەیب
شوانی سوننەت پێغەمبەرانە — تەمرینی شوانی ئۆممەتەکانە

٧٦. ئەگەرشووکردن لەبەر نان ئەبوو — ژن لە ماڵ باوکیا نانی قات نەبوو

٧٧. ئەگەر کاوێژی کردایێ، گۆشتی بۆ خواردن ئەبوو. «وەکو کاوڕ».

٧٨. ئەگەر کەس نەیخواستم، شوو ئەکەم بە تۆ.

٧٩. ئەگەر گورگ نەبێ سەگ گەڵ ئەمانخۆن.

٨٠. ئەگەر گەرەکتە دێر پیربی کاکە! — ئەمانەی ئەڵێم، بیکەی زۆر چاکە
خۆراکی کەم و خواردنی میوە — لەگەڵ بێ خەمی تەڵایە، زیوە
شۆخی ئینسان و گاڵتە کردنی — دەوایە لەبۆ دووری مردنی

٨١. ئەگەر موو بە بەخت ئەبوو، بزن لەسەر تەخت ئەبوو.

٨٢. ئەگەر موو بە بەخت ئەبوو، هەر کەچەڵ بەدبەخت ئەبوو.

٨٣. ئەگەر نابەڵەدی خاڵۆ وەڵەدی.

٨٤. ئەگەر نان گەنممان نەخواردووە، خۆ بە دەس خەڵکەوە دیومانە.

٨٥. ئەلحەمد و کولل و کەوچك — سێفە تاڵە و سرینچك
خواردی و بردی شەلەمین — «ولاالضالین» ئامین

«نەفەرێك چوو بۆ لای فەقێیەك فاتیحای پێ ڕەوان بکات، هەوڵی زۆری لەگەڵ داو ڕەوانی نەکرد، ئەویش ئەو دوو شیعرەی پێشووی پێ ڕەوان کرد».

٨٦. «الحمد لله» سەد شوکری پێوە	نەجات بوو لە دەرس هەستە پارشێوە
ڕەمەزان ڕۆیی زۆر بە دڵ ڕازی	لە ئەهلی ڕۆژوو خوا ببێ ڕازی

٨٧. ئەڵێن: ئەوانە کە مەئمووری گیان کێشانن ئەڕۆن بۆ شکات بۆ حوزووری خوا و ئەڵێن: ئێمە مەئمووری گیان کێشانین کەچی زۆرێك لەوانە کە ئەڕۆین گیانیان بکێشین، بەر لەوە بڕۆین، دوکتۆری ناشی بە دەوا مەسموومیان ئەکەن و ئەمرن. خوا ئەفەرمێ: خەم مەخۆن، ئەوانیش لە دەسم دەرناچن و جەزایان لێ ئەسێنم.

٨٨. ئەڵێن ئەوانە لە دنیادا هەڵنەپەڕیون لە بەهەشتا لە زەماوەندی لەیلێ و مەجنووندا هەڵئەپەڕن.

٨٩. ئەڵێن ژنێ کە زووتر حیز بووبێ، کە پیر بوو ئەبێ بە دەڵاڵ لە بەینی دوو نامەحرەما.

٩٠. ئەڵێن هەر ژنێ گێج و تەتەڵەی خەلە نەزانێ، مارەیی نایێ. «لە دێدا ئەمەیانە وتووە بۆ هەڵنانی ژن لەبەر فێر بوونی ئەم دوو کارە».

٩١. ئەڵێیسێفێکن بوون بە دوو لەتۆ	هیچکەس ناتوانێ لە یەکیان کاتۆ

٩٢. ئەڵێی کەر ناو جۆگەیە لە هەر دوو لاوۆ ئەلەوەڕێ.

٩٣. ئەڵێی کەری جووتیاری، هەر قوتە ئەکەیت.

٩٤. ئەڵێی نانی بەسەر ساجۆ سووتاوە، ئەونە پەلەی ژن هێنانیەتی.

٩٥. ئەڵێی هەنگی لە قوڕوڵە گوێزدا دۆزیوەتۆ.

٩٦. ئەم ڕۆژگارە، ئەوەندە لارو ناباره، هەتا بمێنی خۆزگە بە پارە.

٩٧. ئەمڕۆ کە منالێ هێلکەیەك بدزێ، سۆزی وشترێك ئەدزێ. «هەر لە ئەوەڵەوە بەرگری لێ بکەن».

٩٨. ئەم ڕێگەیە لەڕ کێشە. «واتە: سەرەو خوارییە».

٩٩. ئەمسەر کەری، ئەوسەر کەری	پارەکەری، پینەکەری

«بە فیتنە وا ئەڵێن».

١٠٠. ئەم کاسە بێ ژێرکاسە نیە  بیری کەرەوە بزانە چیە

١٠١. ئەم کەرە نەبێ، کەری‌تر  کۆپانی ئەکەم بە ڕەنگی‌تر

١٠٢. ئەمەلا ئەکەم ئاو ئەمبات  ئەولا ئەکەم گورگ ئەمخوات

١٠٣. ئەم مردووە بۆ ئەو شیوەنە ناشێ.

١٠٤. ئەم نانە بەو ڕۆنە  ئامۆزا خەوتن چلۆنە

«ڕۆژێ کوڕێ پرسی لە دایکی: ئەم خیگە ڕۆنە چیە داتناوە. وتی: ئەم خیگە وەختێ باوکت ئارەزووی ڕۆنی ئەکرد، نانی تێ ئەساوی و ئەیخوارد. وتی: دایە ئەی نەترساوە نانەکە کونی بکات؟ وتی: نەخێر. وتی: دایە من ئەترسم، هەر لە دوورەوە نانەکەی بۆ ڕائەکێشم و ئەیخۆم و ئەڵێم: ئەم نانە بەو ڕۆنە».

١٠٥. ئەمن و ئاسایش لە وڵاتا نەوێت، هیچ دڵێك ناسرەوێت و هیچ چاوێکیش بە بێ‌خەم ناخەوێت.

١٠٦. ئەمە بدرێ و هەزارێ، کۆنە بەی بە هەژارێ. «منداڵێ کە لیباسی تازە ئەکاتە بەر، وای پێ ئەڵێن».

١٠٧. ئەوانە ئاویان بە جۆگەیەکدا ناڕوات. «لە یەك دوورن».

١٠٨. ئەوانە ئەڵێی کەرو خۆڵەمێشن.

١٠٩. ئەوانە بە دەم دۆس و بە دڵ کۆسن.

١١٠. ئەوانە ڕۆژ تا ئێوارە شەڕیانە، ئێوارە ئاشتن، وەکو زەڕنگەر وانە.

١١١. ئەوانە سەرو قنگ لە کلاشێکن  با ڕەنگاو ڕەنگن، لە قوماشێکن

١١٢. ئەوانە فرە پیشە و کەم ڕۆزین.

١١٣. ئەوانە قسەیان لە یەك هەڵئەبەزێت، وەلێ لە یەك نادەن.

١١٤. ئەوانە کارد و پەنێرن. «واتە: دژی یەکترن».

١١٥. ئەوانە کە ئێشی دنیایان زۆرە، ئەجری قیامەتیان زۆرە، لەویا ئاوات ئەخوازن خۆزگا تەواوی بەدەنمان لە دنیادا بە تیغ ببڕیایێ با پاداشمان لێرە زۆرتر بووایە. «حەدیسە»

١١٦. ئەوانە گۆشت یەك بخۆن، پێشەی یەك ناشکێنن.

١١٧. ئەوانە لە سەر هەر سفرەیەك نان بخۆن، لە ئاخرا سفرەکە ئەدڕن.

١١٨. ئەوانە لە کۆماجۆ پارە ئەخەنە خوارۆ بۆیان، هەر فەقیرن.

١١٩. ئەوانە موو بە بەینیانا ناچێ. «ئەونە دۆستن و یەکیان خۆش ئەوێ»

١٢٠. ئەوانە ناسوپاس و نیعمەت بڕن.

١٢١. ئەوانە نانیان وا لە تۆشەبەرێکا، بە یەکۆ ئەیخۆن.

١٢٢. ئەوانە وەکوو سەگ وانە لەیەك ناکەن.

١٢٣. ئەوانە وەنە هەوانە، ناویان خالّییە.

١٢٤. ئەوانە هەموویان جاش کەرێکن، بە یەك سالّ و دوو سالّ و سێ‌سالّ فەرقیان هەیە.

١٢٥. ئەو پەنە بۆ ئەو گەنە باشە.

١٢٦. ئەو دوور ولاّتە بە ناو ژنەوتم — خوا کارێکی کرد شەو تیا خەوتم

١٢٧. ئەوسا زەمانە زەمانەی دلّ بێ — هەرکەس بێ‌دلّ بێ لای خەلّك ماتلّ بێ

ئیسە زەمانە زەمانەی زەڕەن — هەرکەس بێ‌زەڕەن لای‌خەلّك بێ‌فەڕەن

١٢٨. ئەوسا زەمانە زەمانەی دین بوو — ئەوەی زەلیل بوو تەنیا بێ دین بوو

ئێستا زەمانە زەمانەی پوولّە — هەرکەس پوولّدارە، وتەی قەبوولّە

١٢٩. ئەوسا سەف بۆ عیبادەت و خواپەرەستی بوو، بەلاّم ئێستا بۆ کۆپینە. کەچی تۆپین باشتر لە کۆپینە.

١٣٠. ئەو سیرە تۆ خواردووتە، من بە قینچکەکەی گەمەم کردووە. «یا: ئەو خورما تۆ خواردووتە من بە پێشەکەی گەمەم کردووە».

١٣١. ئەو سیرە لە سمێلّی من مەساوە. «واتە: سابوون مەدە لە ژێر پێم»

١٣٢. ئەو شەڕ فرۆشە منیش لاشەرم — یاس و هەراسان لە سەگە شەڕم

خزمەتگوزارم بە مالّ و زەرم — بۆ کەسێ کە ئەو بێتە سەر بەرم

١٣٣. ئەو کەسە دەولّەمەندە کە چاوەڕوانی کەسێکی‌تر نەبێت.

١٣٤. ئەو کەسە گیان ئەدات، هەر ئەویش گیان ئەکێشێ.

١٣٥. ئەوکەسەی پیاوە لەحەق لانەدات — بۆ کەس شایەتی بە ناحەق نەدات

١٣٦. ئەولادی ئێمە، جەرگی ئێمەیە دوای مردن ئێمە، لە جێی ئێمەیە
«حەدیسە»

١٣٧. ئەونە بوێسە تا گیا لە ژێر پێتا سەوز ئەبێ.

١٣٨. ئەونە بەختم شەڕە، بڕۆمە سەر بەحر بۆ مشتێ ئاو، وشك ئەبێ.

١٣٩. ئەونە ددانیان لە یەك سپی بووەتۆ بە یەکۆ هەڵناکەن.

١٤٠. ئەونە درێژە ئەڵێی پلیکانەی جەجاڵە.

١٤١. ئەونە سەرمامە خەریکم پەڕ دەرئەکەم. «وادیارە پەڕدار لە بەر سەرما خۆگرتر بێ»

١٤٢. ئەونە نەسازە، لەگەڵ سێبەر خۆیشیا شەڕ ئەکات.

١٤٣. ئەونەی هاپێوە ئەڵێیت بۆ مزگەوتی گرتووە. «مەبەست داری بەرە، وەکو گوێز و...»

١٤٤. ئەوە چیە؟ ئەڵێی لە گوێی گادا نووستووی. «واتە: بێ خەبەری»

١٤٥. ئەوە چیە ئەڵێی مەڕی و لەدەم گورگ بەر بووی. «واتە: ترسەنۆکی»

١٤٦. ئەوە چیە ؟ ئەڵێی کاسەی کاولی ئاو بردوویە. «واتە: قەرە باڵغە»

١٤٧. ئەوەندە بچۆرە باوان جلی ژێرت بپاوان. «واتە: ئەوەندە بچۆ ماڵی باوکت کە حورمەتت ببێت»

١٤٨. ئەونەت لێ ئەدەم بە کەر بلێیت خالۆ بە موج و جاجم نەبرێیتە ماڵۆ

١٤٩. ئەوەندە خۆت کێش بێنە، نەچرێیت.

١٥٠. ئەوەی بۆ گووکەر ڕێ ئەکەوێ بۆ ڕاوکەر ڕێك ناکەوێ.

١٥١. ئەوەی کە جوانە بەش هەتیوانە.

١٥٢. ئەوەی کە چاکە بۆ دنیاو بۆ دین پێمان عەتا کە «ربّ العالمین»

١٥٣. ئەوەی کە خوا ئەیکا بە ساتێ بە سەد ساڵ فکری ئێمەی ناگاتێ.

١٥٤. ئەوەی کە ساحێب ماڵ ئەیزانێت، دز نایزانێت...

١٥٥. ئەوەی کە لەلای بەندە خەیاڵە لەلای خوای گەورە پووچ و بەتاڵە

١٥٦. ئەوەی کەم بێت و بەش بکات، باشترە لەوە کە زۆر بێت و باییس دڵ مەشغوولی

و سەرقاڵی بێ.

١٥٧. ئەوەی کە مەحەل ڕەحمە نەخۆشە
لە حەیبەت دەرد و بەلا بێ هۆشە
ڕووتی مەکەرۆ بە دەواو دەرزی
ئەو وەختە پیاوی ژیرو سەربەرزی

١٥٨. ئەوەی کە مەلای کوردستان هەسی
لە عیلم و حیلما کەس تر نیەسی
قەناعەت ئەوان کردیان بە پیشە
ڕەگی ئیسرافیان کێشا لە ڕیشە
قەناعەت ئەکەن بەدێی دە ماڵی
دین بەخێو ئەکەن بە دەستی خاڵی

١٥٩. ئەوەی کە هەتە سەرفی کەو بیخۆ
خەفەت بۆ ڕزقی داهاتوو مەخۆ

١٦٠. ئەوەی لای بەندە سەخت و گرانە
لای خوای گەورە سەهل و ئاسانە

١٦١. ئەوەی لە سامان نزیك ئەبێتۆ
ڕەوشتی بەرزی لە بیر ئەچێتۆ

١٦٢. ئەوەی مێلوورە جەمی ئەکات ساڵێ
وشتری ئەیخوات بە یەك قەپاڵێ

١٦٣. ئەوەی هەڵنەگرێ سیلاح و شمشێر
نابێ گوێ بدا بە هەڵمەتی شێر

١٦٤. ئەوێ خۆشە کە دڵ تیا خۆشە.

١٦٥. ئیقباڵ بۆ بەشەر زۆر بێ مایەیە.

١٦٦. ئێمە لەگەڵ عام یا عام لەگەڵ ئێمە. «ئەبێ ئێمە لەگەڵ عاما بین، مادام دژی دین و عەقڵ نەبێت».

١٦٧. ئینسان بە مێوژێك نەزانێت، بە کەویژێکیش نازانێت.

١٦٨. ئینسان تا نەمامێك سەوز ئەکات، عومرێك سەرف ئەکات. «زۆر هۆشت بێ مەیبڕە و ڕەنجی زایە مەکە!»

١٦٩. ئینسان کە تەنگانەی بە سەر هات، بە مووسایی ئەڵێت: بە ڕیش پیاوانەت قەسەم.

١٧٠. ئینسان کەڕەتێك لە دایك ئەبێت و کەڕەتێکیش ئەمرێت.

١٧١. ئینسان نەخوێندە وەکووکوێر وایە
زووتر وا بووە و ئێستاش هەر وایە

١٧٢. ئینسانی «تا» دار هەنگوێن بچێژێت
مەر خودا نەیکا، ئەرنا ئەیکوژێت

«نامی»

١٧٣. ئینسان وەکوو گوێز وایە، بە گواستنەوە قەویتر و سەمەردارتر ئەبێت.

١٧٤. ئینسان هەر ئازارێکی تووش بێت، ئەبێتە هۆی کەفارەتی گوناحەکانی، ئەگەریش

بیٚگوناح بێت، ئەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی دەرەجەی خۆشەویستی لای خوای گەورە.
«حەدیسە»

١٧٥. ئینسانی موسڵمان بە بیٚ دراوسیٚ تێر نابیٚ. «حەدیسە. واتە: هەرچێکیان هەیە بە یەکۆ ئەیخۆن»

١٧٦. ئینسانی ناسوپاس، کەم ڕزق و ڕۆزییە.

١٧٧. ئینسانینەزان وەك مردوو وایە زانا زیندووە هەتا هەتایە

١٧٨. ئێوە ئاون ئەڕۆن، ئێمە ڕیخین ئەمێنین.

١٧٩. ئانە وڵەنە پات نەلۆش پۆرە. «هەورامییە. واتە: هۆشت بە خۆتۆ بێت، لە وتارو قسەو باسو فرماندا بە بیرو هۆش و ورد بین بە، با تووشی زەرەر و ئازار نەبیت. وڵ: کون واتە: ئەوە کونە پاتی پیا نەچیٚ. بۆ بەرچاو خۆت بڕوانە».

***

# پیتی ‹ ب ›

## پەندی پێشینان

١. باجی باجیمە، کاری ناعیلاجیمە.

٢. باجی ڕەعنا تەشی ڕێس بێت، بە کێری کەرەکەیش بووە هەر ئەیڕێسێت.

٣. باخ بە بێ پەرژین زینەتی نیە — کچ بە بێ باوان قیمەتی نیە

٤. باران ئەباری زەوی ئەشۆرێت — کیسەڵ گان ئەکاو ڕێوی ئەتۆرێت

٥. باخەوان لە وەخت مێوەدا کەرە.

٦. با دوژمن بچووك بێ، بە کەمی مەزانە.

٧. بارانێ کەمە و دوو باران زۆرە. «بۆ نۆکی بەهارە».

٨. بارت کرد، یا بچۆ بۆ شارستان یا بۆ دارستان. «ئاسان بژیون».

٩. بار لە باج نانالێنێ، «هەر بارێ بە ئەنازەی خۆی».

١٠. بار لەبۆ کەر و خواردن بۆ یابوو — ئیسەش هەروایە و زووتر هەر وابوو

١١. بارم هەر بارەن، سەربارم خەمەن — کردەوەی وێمەن هێشتا هەر کەمەن

١٢. بارەکەڵلا دوگمە لچە — حەوت شووی کردووە هێشتا کچە

١٣. باری لار بە مەنزڵ ناگا.

١٤. بازاڕ تیژی خۆت بە سەر منۆ مەکە.

١٥. بازاڕم کەساس ڕێی سەودام بەنەن — دونیام تەواو بوو فرسەت نەمەنەن

١٦. باز لە بواردا، ئەگیرێت. «فرسەت لە دەست مەدە!»

١٧. بازنەی ئاڵتوون وا لە دەس، ڕەنگینا!. «مەبەست ژنێکە کە سەنعەت بزانێت، وەك قاڵی کەر، تەون کەر و...»

١٨. بازێ لە منالْ «قُرَّةُ العَین»ن — بازێکی زۆریان «قِیرَةُ العَین»ن

«واتە: بازێ منالْ ئەبنە هۆی ڕۆشنی چاوو بازێکیان ئەبنە باییس دەردو تاریکی چاو».

١٩. باشترین کرێکار کەسێکە بە قووەت و بێخەیانەت بێت. «لە ئایەت وەرگیراوە»

۲۰. باشترین مرۆڤ ئەو کەسەیە، کە خێری بۆ موسڵمانان زۆرتر بێت.

۲۱. باشترین موڵك و میرات جێما بێ لە باوو باپیر عیلم و زانین و عەقڵە، بۆ منالّی بە بیرو ژیر.

۲۲. باشترین موسوڵمان ئەو کەسەیە کە لەگەڵ ماڵ و خێزانیا باش بێت.

۲۳. باشی و بووشی خۆت بە سەر منەوە مەکە.

۲٤. بانگی موحەممەدی بە ئاشکرا خۆشە.

۲۵. بانە نە بە ڕۆژە. «واتە: خۆش نشین بە. وەك ئەڵێن: مەکە نە مەدینە».

۲٦. بانێکە و دوو هەوا. «ئەڵێن پیرەژنێکی هەجیجی لە هاوینا کوڕو بووکەکەی لە سەر بانا خەوتبوون، کچەکەی و زاواکەیشی هەر لەو باناو لە سووچێکیترا خەوتبوون. پیرەژن ئەڕۆی بۆلای کوڕو بووکەکەی و ئەیوت: گەرمە، دوور بخەون. ئەڕۆی بۆ لای کچ و زاواکەی و ئەیگوت ساردە، باوەش بکەن بە یەکترا. کوڕەکەیش وتی: دایەگیان بانێکە و دوو هەوا؟!.» (ئەم داستانە لە «آیة الله مەردۆخ» بە ڕەحمەتی خوا بێ، نەقڵ کراوە).

۲۷. باوان قیبلەیە، پشتی تێ مەکە — بڕوا بە دۆستی بێگانە مەکە

۲۸. باوك بێ برا و ئامۆزای فرە — لەم کارەساتە باش تێ بفکرە

۲۹. باوکمان برایە بەڵام من دوو دانگم لە تۆ زیاترە، چونکە من لە تۆ زۆردارترم.

۳۰. باوکم دیار نیە و گورگیش پیاوێکی خواردووە.

۳۱. باوك و دایك قەولّیان یەك بێت، بارهێنانی منالّ ئاسانترە.

۳۲. باوك و دایك لە بارهێنان و پەروەردەی منالّدا وەکو ئاوێنە وان، هەرچۆن بن، منالّەکەشیان وەك خۆیانە.

۳۳. باوك وەك بەلاّس دایك وەك قەزاس — ژنی جوانخاس نیعمەتی خواس «لای کوڕی بێقابل وایە»

۳٤. با هەر سیر بخواو سوڕنا بژەنێ — نە بڕوانن بۆی، نە گوێیشی بەنێ

۳۵. بدە لە ئاو ئەگەر بیشت با — تۆ مەڕۆ بەر پردی نامەردا

۳٦. بخۆ و بلەرزە. «خواردن زەحمەتیشی هەیە».

۳۷. بدەن لە تەختە، حیزیش بە بەختە.

۳۸. بدەن لە ڕەفیقم وا ئەزانم لە ڕەشکە «کا» ئەدەن.

۳۹. بـــرا بـەڕاسی زۆر خۆشە لادێ بـۆنی یـەکـیەتـی هـەر لـە دێوە دێ

٤۰. برا کە بـمرێت، پشتی برا ئەشکێت. «کەسێك کوڕی بـمرێت، ڕەگی حیاتی ئەپسێت».

٤۱. برا لە پشت برا بێت، قەزا مەگەر لای خوا بێت.

٤۲. برا لە مردن برا حەز ناکات، بەڵام حەز لە دەسکورتی ئەکات.

٤۳. براییك باشە زوڵمت لیٚ نەکات حەز لە ڕسوایی و دەسکورتیت نەکات

٤٤. برامان برایی، کیسەمان جیایی.

٤. بـرا هـەرچـەن شوانە خوشکی هەر چاوەڕوانە

٤٦. برایان شەڕیان کردو قەڵتەبانان باوەڕیان کرد.

٤۷. براییە و گەز گەزی، ئیتر تۆ بۆچ نابەزی.

٤۸. بڕوانـە ڕەنگـم، پرسـە ئـەحواڵم بـــیٚ نــان و ئـــاوو وێرانــە مــاڵم

٤۹. بـڕوانـە دنـیا چـەنـیٚ غـــەددارە هـەرتاویٚ یـەکیٚ گـەورە و سـەردارە

۵۰. بـڕوانـە کـۆزی کـارژەڵـەکەمان جـا قەمـچك بـدە لـە ماسـەکەمان

۵۱. بزانە چۆن خاك بووە بە سەرینم تــازە بــە تــەمای مــەیلی شــیرینم

۵۲. بزانە چەنیٚ بـەخـتـەکـەم شـەڕە کـۆچم ئـاوێـتـەی کۆچی سەگ وەڕە

۵۳. بزانە زانست لە کویٚ هێلانەی کردووە ڕۆڵە بڕۆ بە شوێنیا.

۵٤. بزن ئەگەر نەگبەتی ڕووی لیٚ کات، نانی شوانەکەی ئەخوات.

۵۵. بزن بۆ تەنیا شەوێکیش بێت، جێگای خۆی خۆش ئەکات.

۵٦. بزن حەز لە بەرزایی ئەکات. «تۆش حەز لە سەربەرزی بکە».

۵۷. بزن گەڕۆڵ لە سەر چاوگە ئاو ئەخواتۆ.

۵۸. بزنە قوت لە دەستی من دەرچوو، خوای ئەکرد سەری ئەنا بە هەزار ماڵۆ.

۵۹. بزن هەمیشە زێی وا بەدەرەوە و کەسیش باسی ناکات. مەڕ ئەگەر جارێکیش زێی کەوێتە دەرەوە، پەنجەی بۆ ئەکێشن.

٦٠. بزنیّ گەڕ، ڕانێك گەڕۆلّ ئەكا.

٦١. بمكوژە و ڕیسوام مەكە.

٦٢. بۆ ئەوان دایكە و بۆ من باوەژن ناز ئەدا بەوان، ناز نادا بە من

٦٣. بۆ بازیّ ئەبیّ برنجیّ بە ڕەنج بازیّ بە بیّ ڕەنج دەسی ئەكەویّ گەنج
حیكمەتی ئەمە ئێمە نازانین سیرڕی خوایە و نابیّ بیزانین

٦٤. بۆچی برا ئێمە كوڕ باوەژنین كە بەشمان نیە لە ڕووی سەرزەمین

٦٥. بۆچی ماسە بە دەمتۆ دیار بیّ؟!

٦٦. بۆرەم هەنارد نەهاتی، بازەم هەنارد نەهاتی، خۆت لە خۆتۆ بۆ هاتی.

٦٧. بۆ كەسیّ بمرە پەرێت مەردە بۆ ئەو لە تۆ زیاتر ئیمان هەردە بۆ

٦٨. بۆ هەركویّ ئەڕۆن ببەن سەوقاتی مەحەببەت هەردووی پیّ ئەبیّ قاتی

٦٩. بووكی پووران، كۆلّەخۆری سەر تەنووران.

٧٠. بووە بە پشیلەی سەر چنار. «خۆی بە سەرۆ ناگریّ و نایشتوانیّ بێتە خوارۆ».

٧١. بۆی كالّەك بچیّ بەسەر هەویرا دائەزیّ و شل ئەبێتەوە.

٧٢. بە ئاوی تانجەڕۆ پاك نابێتەوە ئەوەندە پیسە.

٧٣. بە بۆنەی گولّە گەنمێكەوە، سەد گولّە مرۆر ئاو ئەخۆنەوە.

٧٤. بە بێژنگ، بەری خۆر ناگیرێت.

٧٥. بە پای خۆی بەرەو پیری مەرگ ئەڕوا. «واتە: كەسیّ لەگەلّ دەسەلاّتدار شەڕ ئەكا»

٧٦. بە پەن و پیتكەی ئاوایی مەبە خوێڕی و بیّ خاوەن ئاوایی مەبە
كارێك بگرە دەستكە بەكارت بیت با لە نەبوونی زوو ڕزگارت بێت

٧٧. بە تاقە گولّیّ قەت بەهار نایی تا گولّ دیار نەبیّ لە هەموو لاییّ

٧٨. بە تاوان تاییی دۆلاّوی مەگرە. « تا و دۆلاّو ناو دوو دێن لە نزیك یەكەوە لە ناوچەی هەورامانی ژاوەرۆ».

٧٩. بە توندی و تیژی كار نابیّ مەیسەر مار بە لاواندن، لە كون دێتە دەر

٨٠. بەتەجرۆبەی منحەق سەر ئەكەوێت هیچ نیە بە سەر حەقا سەركەوێت

حەق بلێ هەرچەن حەق وتن تاڵە — موخالیفی حەق پووچ و بەتاڵە
ئەگەر بە تەنیا بچی بۆلای قازی — بۆخۆت باش ئەڵێی دیتۆ بە ڕازی
ئەگەر دووکەسێ بچنە لای قازی — یەکێك ڕازیە و یەکێ ناڕازی

٨١. بە تەنیا بگری و لە ناو خەڵکا پێکەنە، با دوژمنت پێی خۆش نەبێ.

٨٢. بە تەنیا دەستێ، چەپڵە ناتەقێ — مەیکە بە گاڵتە و بە دەمە تەقێ

٨٣. بە جوانی جوان و بەرزە دەماخی — بە پیری خەریك خەفەت و داخی

٨٤. بە چاکی‌گوێ‌گرە لەم دەنگو باسە — بێ ژنی تەنیا بۆ خودا خاسە

٨٥. بە چاو خەوتوو بە دڵ وریا — هەتا هەستا، کەرەکەی بریا

٨٦. بەچاوی سووکی مەڕوانە بۆکەس — با حورمەتدار بیت لەلای هەموو کەس

٨٧. بە تیرێك دوو نیشانی پێکا.

٨٨. بەچکە سۆنە لە ئاوا تەڕ نابێ و مەلەوانیشە.

٨٩. بەچکە گەدا مەخەرە تەما، بە چڵێ کەما دێتە سەما.

٩٠. بەچکە مشکەکان جەواڵ ئەدڕن — بەچکەی دزانیش کەلێن ئەبڕن

٩١. بە خاسەخاسە، گووی کردە کاسە — لایدا لە ڕەسم و هەر باوێ خاسە

٩٢. بە خاڵۆ خاڵۆ، هات بە لامەوە — بوو بە توولەمار دای بە پامەوە

٩٣. بەختم لە ئەزەڵ ئەگەرخاس ئەبوو — نیشانەی چەپم لە لای ڕاس ئەبوو

٩٤. بەختەکەم هەوەڵ ئەگەر خێر ئەبوو — کۆچم ئامێتەی قەدەم خێر ئەبوو

٩٥. بەختەکەی خۆمەو سەر قەواڵەیە — بۆ هەرکوێ ئەڕۆم قرپەو قاڵەیە

«قرپە و قاڵە = بەزم و هەرایە»

٩٦. بەختت بێ پاڵەوانی، بەختت نەبێ چاڵەوانی.

٩٧. بەختێ لە ئەزەڵ سیا چارە بێ — لێی گەڕێ هەروا با ئاوارە بێ

٩٨. بەخوا بێ‌کەسی هەربۆ خوا خاسە — بێ کەس ئەوەیە، خوا نەناسە

٩٩. بەشەر خوای ناسی کیفایەتیەکا — لە گرفتاری خۆی ڕزگاریەکا

١٠٠. بە خۆشی زستان، بە بزەی حاکم — کە بڕوا نەکەم، کوڕێکی چاکم

١٠١. بە خۆشی زستان و پێکەنینی زاڵم، بڕوا مەکە.

١٠٢. بە خوو و ڕەفتاری کەس باوەڕ مەکە تا لە تووڕەییدا نەیبینیت.

١٠٣. بەد ناویەکان خۆت لەکوێ ئەبیسی    لـەویا کـە نـاوی هاوسـێت ئەبیـسی

١٠٤. بە دۆسی دۆسی ئەکەنێ پۆسی    فەرق ناکـا بـۆ ئـەو دوژمـن و دۆسـی

١٠٥. بە دۆعای پشیلە باران نابارێت    ئەرنا حەز ئـەکات گـۆشـتـی بۆ بارێت

١٠٦. بە دۆعای کەسێ نەهاتووینەتە دنیا تا بە نفرین کەسێ بڕۆین.

١٠٧. بە دەستی خۆت پشتت نەخورێنی، بایی توورێکە.

١٠٨. بە دەسـمایەی خۆتا بڕوانە نەك بە هەڵە خەرجی هاوسێکەتا.

١٠٩. بە دەسێ دوو کاڵەك هەڵناگیرێ.

١١٠. بە دەم خۆت تیکە ئەجاویت، «بە سەر کەسا منەت مەکە».

١١١. بەدەم خۆت خەڵکی مەکە بەدوژمن    ئـەگەر گوێ نەگری بـۆ نەسێحەت من

١١٢. بە دەم خۆت قسەی خۆت بکە و بە گوێی خۆت بیبیسە. «واتە: با قسە دەماودەم نەکەوێ و تۆ دوا جار پەکت بۆ قسەکەت نەکەوێ»

١١٣. بە دەم خۆت هێلانەکەت مەشێوێنە.

١١٤. بە دەمێك دوعا بکە بۆ خۆت گوناهت پێ نەکردبێ. «واتە: دۆعای خێر بکەن بۆ یەکتری»

١١٥. بەدەنم هەمووی بکەن دەرزیا ژن    تەنیا بەو شـەرتـەی پێم بلێن کوێخا ژن

١١٦. بەدەنی ئینسان تا وەرزش و نەرمشی زۆرتر بێت، بە هێزترو سالـمترە.

١١٧. بەدەنی خۆت قورس مەکە و قورس و شەربەتیش مەخۆ

حەز لە نەخۆشی ناکەی، خەمی بێ جێگە مەخۆ

١١٨. بەراتەکەت بکە بە داڕووجان. «واتە: من موحتاجی تۆ نیم»

١١٩. بەڕاسی خوای گەورە بەشەری خۆشخوو و تەبیعەت نەرم و ڕوو خۆشی خۆش ئەوێ. «حەدیسە»

١٢٠. بەرتیل بەرد نەرم ئەکات. (بەرتیل: ڕشوە) «ئەم پەندە لەم ڕووداوەی خوارەوە وەرگیراوە:

دارێك لە شوێنێکا بوو. خەڵك وەکو بت ئەیان پەرەست و عیبادەتیـان بـۆ ئـەکرد.

زاهیدێك لە نزیکی دارەکە و لە غارێکدا ئەژیا. ڕۆژێك لەو بت پەرەستییە وەڕەس بوو و تەورێکی هەڵگرت و ڕۆیی کە دارەکە ببڕێت. شەیتان ڕێگای لێ گرت و وتی مەیبڕە. زاهیدەکە وتی: یەقین ئەیبڕم. شەیتان و پیاوە زاهیدەکە ئاوقەی یەکتر بوون و زاهید سێ جار شەیتانی دا بە عەرزا. شەیتان پێی وت ئەو دارە مەبڕە من هەر ڕۆژێك چوار دیرهەمت پێ ئەدەم. پیاوەکە نەرم بوو و وتی باشە. شەیتان تا چوار ڕۆژ هەر ڕۆژێ چوار دیرهەمی ئەخستە ژێر بەرماڵەکەی، دوای چوار ڕۆژ تەرکی کرد. پیاوەکە تووڕە بوو، تەوری هەڵگرتەوەو چوو دارەکە ببڕێت. شەیتان دوبارە ڕێگای لێ گرتەوەو دوبارە ئاوقەی یەك بوون، بەڵام ئەمجار شەیتان سێ جار پیاوەکەی دا بە عەرزا. زاهید سەری سوڕ ماو وتی: ئەوە چۆن بوو، ئەوجار من تۆم دا بە ئەرزا، کەچی ئێستا تۆ وا دەرەقەتی من هاتی! شەیتان پێی گوت: جاری پێشتر بۆ خوات ئەکرد، بۆیە دەرەقەتت نەهاتم، بەڵام ئێستا بۆ دیرهەمەکانی ئەکەیت و چارم ناکەیت. ئەم چیرۆکە ئیمامی غەزالی لە کتێبی "احیاء علوم الدّین"دا نەقلی ئەکات».

١٢١. بەرخی نێر، بۆ سەر بڕین باشە.

١٢٢. بەرد لە جێگای خۆیدا سەنگینە.

١٢٣. بەردێك نەزان بیخاتە گۆم، بە هەزار زانا نایەتە دەر.

١٢٤. بەردی ناوەتە مەڵۆ. «واتە: کاری قایمە»

١٢٥. بەرگی فەقیر دڕا. «واتە: هاوین ڕۆیی»

١٢٦. بەرلەوە باران بباریێت، دلۆپەی بانەکەت بگرسێنەوە.

١٢٧. بەرلەوە بچیتە ژوورەوە، تەگبیر بکە چۆن بیتە دەرەوە.

١٢٨. بەر لەوە ماڵ بسێنی، هاوساکانت بناسە.

١٢٩. بەر لە هەمووکەس نەسیحەت خۆتکە / کە خۆت وەرتگرت جا بۆخەڵکیکە

١٣٠. بەرەی خۆت هەرگیزمەخە ژێر خەڵکی / ئەگەر پیاوێکی ژیرو بە کەڵکی

١٣١. بەرەکەت ئەوەیە ژنەکەت کەم ئەرك و دەس پێوەگرو دەس ڕەنگین بێت.

١٣٢. بەرە لە لای تەنگیەوە ئەدرێت، «زەرەر لە بێ دەسەڵات ئەکەوێت».

١٣٣. بە ڕیشی پان و پرچی پڕ لە ئەسپێ — بناغەی دینی ئیسلام چۆن ئەچەسپێ

١٣٤. بە ئیمان و عەمەڵ باشە ئەچەسپێ — ئەبێ مارکی‌تری پێوە نەچەسپێ

١٣٥. بەش‌کەر بەشی‌کرد بەش منی‌کەم دا — ئەویشە کە دای پەژارە و خەم دا

١٣٦. بە سەر سفرەی باوك و دایکیەوە گەورە نەبووە، «بۆیە ئەونە نانەجیبە».

١٣٧. بە شوێن دزا ئەوەندە بڕۆ کە لیێت هەڵنەگەڕێتو.

١٣٨. بەشەر بە پیری فێری پڵاو خواردن بێت، لە جیاتی دەم، دەس بۆ لووتی ئەبات.

١٣٩. بەشەر بە سەگ بێت و بە برای بچووك نەبێ ئەونە فرمانی پیا ئەدەن.

١٤٠. بەشەر لە بەرد سەخت‌ترە و لە گوڵ ناسك‌تر.

١٤١. بە شەوا جەردە و بە ڕۆژا مەردە — بۆی موهیم نیە هەردە یا بەردە

١٤٢. بە شەوا خانمە و بە ڕۆژ کارەکەر — بۆ ماڵ خۆی دایم وەسە کاریگەر

١٤٣. بە قسەی مەلا بڕوا قەد ناکەیت — باوەڕ بە سەڕەی نێرەکەر ئەکەیت؟

«کەسێك ئەچێت بۆ لای مەلا نەسرەدین و داوای لێ ئەکات کەرەکەی پێ بدات. مەلاش حەز ناکات و ئەڵێ کەرەکەمیان بردووە. لەوکاتەدا کەرەکەی ئەسەڕێنێت، کابرا ئەڵێ: ئەی ئەوە کەرەکە نیە؟ مەلا ئەڵێت: بە قسەی مەلا...»

١٤٤. بە قلیانی تاڵ بە چای‌یەك ئاڵ — ئاشنایی بگرە لەبۆ هەزار ساڵ

١٤٥. بە گوێرەی هات‌و چوونی هەناسە — خوا لایقی شوکرو سوپاسە

«هەناسە نیعمەتێکی گەورەی خوایە و دەوامی عومری گیانداری تیایە».

١٤٦. بەڵا لە بۆگەن ئەبێتو، خۆت لێ بدە لە بۆگەن با بەڵات لیوە دوور بێت.

١٤٧. بە لای ژنانۆ دەردە دڵ مەکە — لە نیازی دڵت ئاگایان مەکە

١٤٨. بە ناوی‌کەسێ کە خۆی بێ‌کەسە — لەبۆ بێ کەسان هەر خۆیە کەسە

١٤٩. بێدەنگی باشە تاکو دەنگداری — قەناعەت باشە هەتا قەرزاری

١٥٠. بێن و براکان بە ڕەسم و یاسا — بین بە خاك بەر پێی خوا شناسا

١٥١. بەو با ئەژیم کە لە تەرەف تۆوە بێت بۆ لام.

١٥٢. بە وەرزش و بە نەرمش، بەدەن مرۆڤ سووك ئەبێ، بە تەمەڵی و بێکاری قورس و تەوەزەل ئەبێ.

١٥٣. ببیٚ بە پرد، پێی لیٚ نانێم. «واتە: نارِۆم بە سەریا ئەوەندە عەزیزە»

١٥٤. بینێن بە سەر نانۆ، سەگ بۆی پێوە ناکا. «ئەوەندە بۆگەنە»

١٥٥. بێنە و نیەی ماڵ مەلات نەبیستووە و نەتدیووە.

١٥٦. بینێن بەسەر چاو کوێرۆ، خۆشی ئەکاتۆ. «ئەوەندە جووانە»

١٥٧. بە جاریٚ دوو تەون مەگرە دار.

١٥٨. بە فەرمایشی ڕەسووڵی نازار | تێرە ناخوا هەرگیز چوار شت لە چوار
میٚچکە لە نێرو چاو لە ڕوانین | زەوی لە باران، زانا لە زانین

١٥٩. بۆ کەسیٚ بمرە بۆت بمریٚ.

١٦٠. بۆ وا بۆم ئەڕوانی؟ مەگەر تا ئێستا «هیندی»ت نەدیوە!. «کەسێك وا ئەڵیٚ کە یەکێکیتر زۆری بۆ بڕوانیٚ. ئەڵێن کچان و ژنانی ولاٚتی هیندوستان زۆر مەشهوورن بۆ جوانی»

***

# پیتی < پ >

## پەندی پێشینان

١. پا ئەدات لە پەیین.    «واتە: بێ کارو بێ کارەیە»

٢. پات ئەوەندە درێژ مەکەرۆ کە بیبڕن.

٣. پادارا گێردێ، بێ پێ ماڵو وێمانێ.

٤. پادار لە ڕێی بێ پا ناوەستێت، «ئەوەندە تەنگانەیە».

٥. پارە بە میوەی بدەی باشترە لە دەواو دوکتۆر.  «واتە: مێوە بخۆ کە بەرگیری لە زۆر نەخۆشی ئەکات»

٦. پاشا گەردانی ڕووی کردە وڵات    سەرۆکەکانی زووتر لائەبات
دەسەیەك تازە دێنێتە سەر کار    وا بووە و وا ئەبێ چەرخی ڕۆژگار

٧. پاڵەوان ئەو کەسەیە بێ منەت خۆی بەخێو بکات.

٨. پاڵەوان ئەو کەسەیە کە لە کاتی تووڕەییدا، خۆی بگرێتەوە و نەیقۆمێنێ. «حەدیسە»

٩. پای پەتی باشە لە پێڵاوی تەنگ    بێ ماڵی باشە لە ماڵی پڕ دەنگ
گای زل بێوڵەتە، سەر زل دەوڵەتە    قەناعەت مایەی زۆری سەروەتە

١٠. پاییز هەتیمچە، زستان ڕێبوارە    نیشانەی بەهار، گەڵای مازوارە

١١. پایێکی وا لەم دنیا و پایێکی وا لەو دنیا.  «ئەوەندە نەخۆشە»

١٢. پرسە لە برسی دوو دوو چەند ئەکات؟ ئەڵێت چوار کولێرە.

١٣. پرسیان لە شەیتان تۆ کێت زۆر خۆش ئەوێ؟ شەیتان وتی: دەڵاڵ. من تەنیا فێری درۆم کردووە، کەچی ئەو سوێندیشی لە سەر ئەخوات.

١٤. پیری وەکوو گۆمی قووڵ و لیڵ وایە، بێخەکەی قوڕو لیتەیە، تا بەشەر تێی نەچەقێت، قەدری جوانی نازانێت و بەزەیی بە پیرا نایەتەوە.

١٥. پشتیوانی چەوساوان و دوژمنی ستەمکاران بە. «فەرموودەی: حەزرەتی عەلییە ﷺ»

١٦. پشکیل هی‌خۆتە مەیخەرە دەس خەڵك   هەتا بمێنی بە باشی و بە کەڵك
١٧. پشیلە بۆ ڕەزای خودا مشك ناگرێت، «بۆ تەماعی خۆیەتی».
١٨. پشیلە دەمی بە دووگ نەئەگەیشت، ئەیگوت لایبە سوێرە.
١٩. پشیلە زانی گووەکەیان نواند بۆ دەوایی، شاردیەوە.
٢٠. پشیلە ساڵێك یەك جار نەورۆزیەتی، عالەم پێی ئەزانێت.
٢١. پشیلە لە کووانوەکەیدا خەوتووە. «واتە: بێ ژن و ماڵەی، ڕەبەنە»
٢٢. پشیلە لە ماڵیاندا سەفرا ئەکات. «واتە: ئەوەندە بێ نەواو نەدارن»
٢٣. پشیلە و سەگ کەم بەرەکەتن، هەر ساڵێك چەند جار ئەزێن، زۆرێك بەچکەیان لێ ئەبێت، کەچی هەر کەمن. بەڵام مەڕ هەر ساڵێك جارێك ئەزێت، ئەم هەمووە لێیان سەر ئەبڕین و کەچی هەر زۆرو بە بەرەکەتن.
٢٤. پووڵدار کەباب ئەخوات و بێ پووڵ دووکەڵەکەی.
٢٥. پووڵی حەرام خەرج دەواو دوکتۆر ئەکرێ.
٢٦. پەڕ تاوست گەرەکە، ئەبێ زەحمەت هیندوستان بکێشی.
٢٧. پەرژین بۆ حەیادار ئەکرێ، «بێ حەیا بە پەرژینۆ ناوێسێ».
٢٨. پەشیمان ئەگەر شاخی بڕوایێ   ئەبوا من گەزێك شاخم هەبوایێ
٢٩. پەنا بە خودا لەو پەنەی داومە   تازە کەی وەختی چاوە ڕاومە
٣٠. پەنا بە خوداو ناو هەوانەکە   ئیتر کار بکە و هیچ هەرا مەکە
٣١. پەشیمانی نەوتن لە پەشیمانی وتن باشترە. «بیر کەرۆ جا قسە بکە»
٣٢. پیازەکەی عەودالآنە، خواردنی هەیە، بردنی نیە. «عەودالآن ناوی کێوێکە لە ناوچەی هەورامان جۆرە پیازێکی هەیە کە لەویا بیخۆیت تامی پیاز ئەدات و ئەگەر بیبەیتەوە وەکوو سیری لێ دێت».
٣٣. پیاو ئەوە نیە کە تەنیا پیاوی دنیا بێ، پیاو ئەوە نیە کە تەنیا پیاوی قیامەت بێ، بەڵکو پیاو ئەوەیە کە پیاوی هەردوو دنیا بێ. «حەدیسە»
٣٤. پیاو تا نەمرێت، قەدری نازانن.
پیاوی گەورەمان نایەتە بەر دڵ   هەتا ئەو ڕۆژەی ئەچێتە ژێر گڵ

ئینجا بۆی ئەگرین بە جۆش‌و بە کوڵ　　قەبرەکەی ئەکەین بە باغچەو بە گوڵ

۳۵. پیاو چاك ئەگەر ژن خراپی بێ　　ئەم دونیا بۆ ئەو جەهەنەم ئەبێ

۳٦. پیاو سیروانە، ژن بەریانە. «پیاو با ڕزقی زۆریش بێنێتەوە ماڵ، کە ژن بەری نەگرێ و دەستی پێوە نەگرێت، هیچیان بە هیچ نابێت».

۳۷. پیاو کە پیر بوو، ژن بیانووی وای پێ ئەگرێ کە لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نەبێ.

بە پیری ژنی جوان مەهێنە　　ڕیسوایی بەسەر خۆتا مەهێنە

۳۸. پیاو مردنی باشترە لەوەی کە ژن نان و نەفەقەی بۆ پەیا بکات. ژن، شوو گوزەرانی بۆ دابین نەکات بۆ چیەسی؟.

۳۹. پیاو موو دارو ژن بێ موو، ڕەسەن و پەسەنن. «حەدیسە»

٤۰. پیاو کە نەگبەتی بەرەکی گرێت　　لە وەخت پیریدا ژنەکەی ئەمرێت

٤۱. پیاوەتی ئەکەی با هەتا سەر بێ　　ئەگەر لە پێی گیان یا لە پێی سەر بێ

٤۲. پیاو هەیە جێگای باوکی ئەگرێتەوە، هەیشە جێگای دایکی.

٤۳. پیاوی ئازا ئەڵێت: پێم خۆشە لە جەهەننمدا بژیم بە سەربەستی، نەك لە بەهەشتا بە ژێردەستی.

٤٤. پیاوی ئازا لە ژیاندا یەکجار ئەمرێت، بەڵام پیاوی ترسنۆك هەر ڕۆژێکی مەرگێکە.

٤٥. پیاو یا بە هەوانەیە پووڵ ژن دێنێت، یا بە هەوانەیە درۆ. «جا ئەگەر هەر دوویانی بێ، باشترە»

٤٦. پیاوی پووڵدار یا ژن ئەهێنێ یا ماڵ ئەکاتۆ.

٤۷. پیاوی دوو ژنە، جەرگی کون کونە.

٤۸. پیاوی ژیر کە ماری کوشت، بەچکەکانی بەخێو ناکا.

٤۹. پیاوێ کە ژیر بێ و عاقڵ و هۆشیار　　لە کونێکۆ دوو جار پێوەی نادا مار

«حەدیسە»

۵۰. پیاوی فەقیر یان کوڕی ئەبێ یان کچ.

۵۱. پیاوێك چووە لای بالۆڵ و پێی وت: بالۆڵی زانا، ئەمەوێ مامەڵە بکەم، چی بکەم باشە؟ بالۆڵ وتی: خوێ بکڕە. پیاوەکە خوێی کڕی و پاش فرۆشتنەکەی قازانجی زۆری

کرد. پاش ماوەیەك گەڕایەوە لای و وتی باڵوڵی شێت ئەمجارە چی بکڕم باشە؟ باڵوڵ وتی بچۆ پیاز بکڕە، کابرا پیازی زۆری کڕی و چووە لای باڵوڵ و وتی پیازی زۆرم کڕیوە، چی لیێ بکەم، باڵوڵ وتی: بیخەرە ناو ماڵێك و لە کونایەکەوە ئاوی تیێ بکە. کابرا وای کردو پاش ماوەیەك پیاز چەکەرەی کردو خراپ بوو. کابرا هاتەوە و وتی ئەوە چ ئامۆژگاریەك بوو کردت؟ باڵوڵ وتی: کاری شێت لەوە چاکتر نابێت.

٥٢. پیر بووم و تەواو هێزم نەماوە — دوای پیری ئیتر مردنم ماوە

٥٣. پیر بووە تازە، نەماوە باوی — ڕیپۆق داویەتە ناو هەر دوو چاوی

٥٤. پیر بە دەرد خۆیۆ داکەویێ باشە — تازە چی لە سەر نانەوەی ئاشە

٥٥. پیر بە تیکە بەندە، ئەمە زۆر ڕاس و زۆریش پەسەندە.

٥٦. پیر هەرچی هەیە بیخوات! ئەگەر نەیخوات زەرەری کردووە و بە میرات جیێ ئەمێنیێ.

٥٧. پیر زۆرتر تەگبیریان پیێ ئەکرد، بەڵام ئێستا هەر منالێك تەگبیرێکی بۆ ئەکات.

٥٨. پیر کە کۆکی و نەترِی، دوورە مردنی، شێخ ڕەزایە و بیێ قەزایە.

٥٩. پیرم و لێم قەوماوە، هێزی ئەژنۆم نەماوە، کەی ئەمە دەس و چاوە، «یەکیێ بە دوو ئەبینیێ».

٦٠. پیر کە ناتوانیێ هەڵسیێ بە زەبری عاسا نەبیێ — ئیتر هیچ کەس بە تەمای هەڵسانی عاسای نەبیێ

٦١. پیرە، بە پیری ئەشقی جویوە — دوو قرانی داوە و لووتی سمیوە

٦٢. پیر و پۆش هاتوونەتە خرۆش. «پۆش بە بەشەری دوو موو ئەڵێن»

٦٣. پیرەزا لە مرۆڤ و حەیواندا، بیێ تین و زەرد و لاوازە.

٦٤. پیرەژنێکی فەرهادکوژە. «فەرهاد کە زۆر حەزی لە شیرین ئەکرد قەولیان پیێ دابوو کە بەو شەرتە ئێمە پێت ئەدەین، تاقەوسان و عەکسی شیرین بە قولنگ درووس بکەی، ئەمجا شیرینت پیێ ئەدەین. ئەویش لە خۆشی شیرینا ئاسارێکی مێژوویی درووست کرد. یەك دوو ڕۆژی مابوو کارەکەی تەواو بیێ «شیرۆ» کە ئەویش زۆر حەزی لە شیرین ئەکرد وتی بە پیرەژنی فەرهاد کوژ کە فەرهاد نزیکە کارەکەی تەواو بکاو شیرینی بدەنیێ، تەگبیرێکم بکە. وتی: بەو دیێیانە کە لە فەرهادۆ نزیکە دەستوور بدە شەوو ڕۆژیێ ساوا مەخەنە ژێر حەیوان تا من خۆم پێت بلێم چی بکەی. دوای شەوو ڕۆژەکە وتی بە شیرۆ:

ئەڕۆم بۆ لای فەرهاد، کە نزیکۆ بوومۆ حەیوانەکان بێنن بۆ لای ساواکان با هەر یەکی بچنە ژێر دایکی خۆیان. کە نزیك بووەوە لە فەرهاد بوو بە هەرای ساواو باڕەی دایکیان و قیڕەی خاوەنەکانیان. فەرهاد وتی: ئەوە چیە. پیرەژنی فەرهاد کوژ وتی: ئەوە شیرین مردووە. فەرهاد کە زۆر نارەحەت بوو پیرەژنەکەی لە پێشا هەڵقلێشاندو دوای ئەوە قولنگێکی دا بە سەر خۆیا و خۆی کوشت».

پیرەژنیفەرهادکوژ ئەو پەنیە دا بە فەرهاد — عومریعەزیزو ڕەنجی هەمووخستە بەری باد

٦٥. پیریێ بە پیری خۆیۆ داکەوێ — باشترە لەوەی بەرەو دوا کەوێ

٦٦. پیرێك بە تەشەرەوە بە کوڕەکەی وت: ڕۆڵە من پێ گەیشتم، تۆ حەسایتۆ، کوڕەکەی وتی: باوە تۆ لە من قاڵب سووك تری، بۆیە لە من باشتری.

٦٧. پیریو سەد عەیبو قەرزاری هەزار — قەرزی بێ جێگە نەکەی ئەی هۆشیار

٦٨. پیری هاتووە بە پیریمەوە — کەس نیە بە تەنگ زویریمەوە

٦٩. پیسی زوو بیشاریتەوە باشترە، تا بلاوی کەیتەوە بۆگەنترە.

٧٠. پێشەنگی قەتار کەر بێ، هەموویان ملیان ئەشکێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: سێ کەس جێگەی ڕەحمن یەکەم: پیاوی ماقوولە کە لە ناو قەومەکەیا زەلیل بووبێ. دووهەم: دەوڵەمەنێ کە فەقیر کەوتێ. سێهەم: زانایێك کە لە ناو نەزانانا گیری کردبێ.

٧١. پێغەمبەری خوداﷺ لە هەرماڵێکدا چاوی بکەوتایێ بە ئامرازی فەلایی، ئەیفەرموو، ئەمە ئەسبابی زەحمەتە و هۆی بەرەکەت. «بەڵێ ڕاستی فەرمووە، ئەو زاتە گەورەیە لە حاڵی هەمووان ئاگادار بووە و ڕێزی تایبەتی بۆ فەلا گرتووە»، شاعیر ئەڵێت:

بەزەحمەت فەلا گشت بەرێ ئەچین — با تەرکی نەکەین ئەم چین بۆ ئەو چین

هەرچەن زەحمەت و مەینەتی زۆرە — خێر و ئیحسان و بەخششی زۆرە

٧٢. پێڵە خۆرە پێڵەچی، هین هاتووە بە قەمچی، هەرمن هاتم تۆ دەرچی، ئیتر ئەڕۆی یا ئەتۆپی. «ئەم پەندە لەوە وەرگیراوە کە: وەختێك کەڵوەخۆرە دانە نۆکی ئەخوارد، لە ناو کەڵوەکەیا زەرەری زۆری ئەداو سەمیش نەبوو کە سەمپاشی بکەن و بیکوژن. ژنێك بەرچاکێك خۆڵە کەوەی ئەبردو ئەیپژاند بە نۆکەکەدا، ئەمە لە حاڵێکدا بوو کە

دەرپێکەی دائەکەندو ئەم شیعرەی سەرەوەی ئەخوێند».

٧٣. پێنجو دوو ڕۆژێك ئاو ها بە بێلۆ          خوا وێش مـزانـۆ چـەرخ چـەنی گێلۆ

٧٤. پێنج پەنجە بران، وەلیٚ وەك یەك نین. «واتە: لە بەین هەر چینێکا جیاوازی هەیە»

٧٥. پێنج و شەشین خزمەتکار مەشکە ڕەشین. «مەشکە ڕەش بە سك ئەلێن»

٧٦. پێیان نەئەدا پیازیٚ، دووان دووان ئەخوازیٚ.

***

# پیتی ‹ ت ›

## پەندی پێشینان

١. تا ئەم ئەکەم، ئەو ئەبێت          تا ئەو ئەکەم، شەو ئەبێت

«ژنی پیر وا ئەڵێت»

٢. تا ئێستا شەقەی قەڵماسکی نەبیستبوو. «هۆی ئەم قسە ئەمەیە: ئەڵێن ساڵێکی بێ باران خەڵك دوعاو نزاو نوێژە بارانیی زۆریان کردو هەر نەباری، خەڵك چوون بۆ لای کوفر ئەحمەدو ئەویش لەبری دوعا ئاسمانی دایە بەر بەردەقانی (قەڵماسك)، بە ڕێکەوت باران باری، کوفر ئەحمەد وتی: خوا گیان تا ئێستا شەقەی قەڵماسکی نەبیستبوو، بۆیە نەیئەباراند».

٣. تا ئێستا هەرچێکت کردووەتە کاسە، لەمەو بە دوا بیکە کەوچك. «واتە: من نیازم بە تۆ نیە، منەتم بە سەردا مەکە».

٤. تا ئێوارە قسەی بۆ بکەیت، وەك ئەوە وایە گوێز بە دیواردا هەڵخەیتۆ، «هەر خڕەکەی لێ حاڵی ئەبێت».

٥. تا بمێنین، سەمەرە ئەبینین.

٦. تا بەدەنت قورسترِ بێت، ئەزیەتی بۆ خۆت زۆرترە، بۆ شاردنەوەیشت لە قەبرا گرانترە، کەوایە کەم بخۆ با ئەرکت سووکتر بێ.

٧. تا بەڕوو زۆرتر بێت، سمۆرە برسیەتی.

٨. تا بەد نەبینی، بەدخانە بە یاد ناکەیت.

٩. تا پێت ئەکرێ کەم بخۆ، ئەگەریش ئەتوانیت مەعیدەت بکە بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خۆراك، بەشێکی بۆ خواردنەوە، بەشەکەیتری بۆ پشوو. «لە حەدیسەوە وەرگیراوە»

١٠. تا تەجرەبەی نەکرد، بڕوای نەکرد.

١١. تا تەنگانەت بە سەردا نەیێت، دۆست و دوژمنی خۆت ناناسیت.

١٢. تا تیکەت نەجاویوە، قووتی مەدە.

١٣. تا جووانی مەستی، تا پیری سستی          ئیتر ئەبێ کەی، خودا پەرستی؟
١٤. تا جێگاو ڕێگای وتەت نەکەیتۆ          باشتر وەهایە دەمت نەکەیتۆ
١٥. تا چەرمەکە سەگ نەی بردووە، کارێك بکە. «کە بردی هیچ ناکرێت».
١٦. تا چەرمت دەق نەکەم، وازت لێ ناهێنم. «هەرەشەیە»
١٧. تا خوا سەری دابێ، ڕۆزیش هەر ئەدات:

خەفەت مەخۆ بۆ ڕۆزی          ئەگەر مایتۆ تا سۆزی
خوا بۆت ئەنێری ڕۆزی          لە تەڕو وشك و سەوزی

١٨. تا خۆت تەجروبە نەکەی، ژن مەهێنە، نان و گوزەرانی ئەوێت.
١٩. تا دادە نەکات بۆرە بۆرە          کاکە ناکات کاری زۆرە
٢٠. تا دارێك ماوە بە دالاهۆوە          من هەر ئەمێنم بە تاسەی تۆوە
٢١. تا ڕەفێقی کەسێکت نەکردووە، مەڵێ چاکە، یان خراپە.
٢٢. تا ڕیخ ئەبڕێت لە ڕووخانە          هەر قەوم باشە لە بێگانە
٢٣. تاریکی چرا بووە بە بەشم          خەتای کەس نیە، خۆم چارە ڕەشم
٢٤. تاریکی مانگ سەر لە ئێوارە دیارە.
٢٥. تازە ئەو کێچە لە گوێچکەتا دەربێنە. «ئەو خەیاڵە بەتاڵە لە دڵتا دەرکە»
٢٦. تازە کەوتە ڕوو، کۆنە کەوتە چاڵ کەنوو.
٢٧. تازە کە هاتە بازاڕ، کۆنە دەرچووە لەشار.
٢٨. تا ساحێب ماڵ یانەنە، مریشکو چێو کولانەنە.
٢٩. تا سەبیلی زەردو سووری فێنکە دووری خۆم بێ

قولتە قولتی نێرگەلەو تۆپی سیگارم بۆچیە؟
تاکوو شاڵی دەق کراوی کۆت دڕاوی خۆم بێ
پارچە فاسۆنی فەتاح پاشای عێراقم بۆچیە؟
تاکوو جاوی ڕەنگ کراوی دەس هەجیجی خۆم بێ
مەخمەڵ و چیتو حەریرو ماڵی چینم بۆچیە؟

تا هــەنــارو ســێــوو هەرمێ و پەپکە هەنجیرم پێ
چایی هێندوستان و قاوەی دوور ولاتم بۆچیە؟
«لە شێعرێکی مامۆستا قانع وەرگیراوە»

٣٠. تا شارەزای ڕێگایەك نەبیت، پیایدا مەچۆ.

٣١. تا ژیرە بیری کردۆ، شێتە کاری خۆی کردۆ.

٣٢. تا فەرز وەستا بێ سوننەت بەتاڵە — مەیکە بــە گــرمــە و بــە قــیلە و قاڵە

٣٣. تاقانە، یان شێتە یان دێوانە.

٣٤. تاکو ئەتوانیت ئەرکی خۆت قورس مەکە، سادە بژی با دلّت ئاسوودە بێت.

٣٥. تاکو ئەتوانی خۆت قەرزارو ژێر چەپۆکەی خاوەن قەرزو دوکتۆرو دەوا مەکە.

٣٦. تاکو ئەتوانی دەسەنە خوار مەبە، کاریگەر بەو نانی بێ منەت بخۆ.

٣٧. تاکو ئەمتوانی، نەمئەزانی چی بکەم، ئێستا کە ئەزانم، ناتوانم هیچ بکەم.

٣٨. تاکو تیکە نەجاوی، قووتی مەدە، «قسەش تا بیرت لێ نەکردۆتەوە، مەیکە».

٣٩. تا خان ئەخێزییێت، لەشکر ئەترازێت.

٤٠. تاکو ڕەنج نەدەیت، بە تەمای گەنج مەبە.

٤١. تاکو قسە لە دلّتایە، ئەسیری تۆیە، کە لە دلّت دەرچوو، تۆ ئەسیری ئەوی.

٤٢. تا کەنێ نەڕوخێ کەناوێ پڕ نابێ.

٤٣. تا کەوشێکمان لە دیواندا بێت، بەسمانە.

٤٤. تالاّن بێ هاومـاڵ تـەواو کـراوم — بۆیــە وا کــز و مــات و شــێواوم

٤٥. تا لە پێشدا پارتی پەیـدا نەکـەی — خەیــاڵی مــاڵی میــران نــەکەی

٤٦. تاکەی لارە ملی، ئیتر بەسیەســی — با لـیرە بار کەم، چم بـۆ ســەڵـەســی

(سەڵەسی: ناوی گوندێکە لە نزیکی مەریوان)

٤٧. تا گۆم تاقی نەکەیتەوە، مەلەی تێدا نەکەی.

٤٨. تا گۆم قووڵتر بێت، مەلەی خۆشترە.

٤٩. تا گوێرەکە ئەبێ بە گا، خوێنی خاوەنەکەی ئەبێ بە ئاو.

٥٠. تا گەنم نەکێڵی، خەرمانی لێ هەڵناگری.

٥١. تا لە منداڵەکانت نەمێنێتۆ، مەیدە بە مزگەوت.

٥٢. تا ماندوو نەبی و ئارەق نەڕێژیت منالْ بـە خۆشـی و سـەربەرزی ناژیـت

٥٣. تا مردی نەمدی کلاش بە پاتـۆ کـە مـردی بـا بێـت بـە سـەرینای تـۆ

٥٤. تـا مـەجاز نەبۆ، حـەقیق نـمەبۆ حەقـیق بیٚ مەجاز، تـەحـقـیـق نـمەبـۆ

«مامۆستا صەیدی»

٥٥. تام دەمی خۆشە بۆ وتن، کۆلْ نادا تا خۆر کەوتن.

٥٦. تا مردنە، هەر کردنە. «بەشەر نابیٚ بیٚکار دانیشێت»

٥٧. تا من تۆم گرت، تۆ منت گرت.

٥٨. تان و پۆی هەورێشمە، بۆ درووست کردنی مەوج و بـەرماڵ. «ئـەو تالأنـەی کـە هەوەلْ جار ڕایان ئەکێشن، پێیان ئەڵێن "تان"، ئەو بەنانەش کە دواتر لەوانیان ئەتەنن پێیان ئەوتریٚ "پۆ". بە سەیدێك کە باوك و دایکی سەید بیٚ ئەڵێن تان و پۆ هەورێشم».

٥٩. تا نەکێشی جەفا، نابینیت سەفا.

٦٠. تا نەگەیشتووی بە بووار، قول هەڵ مەکە.

٦١. تانە و تەشەری خەڵکیم لیٚ هاتە دی بە نزیکی و قەومی کردن لەگەڵ تۆ.

٦٢. تانەی ژن لە پیاو نادرێت.

٦٣. تا نەینا لە تەبەق، نەیوت «الله صدق»

٦٤. تاوانبارو خەیانەت پیشە، ترسنۆکن.

٦٥. تاوانباری خەڵك مەهێنە سەر خۆت بە وتـەی درۆو بە واتــەی بیٚـکـەڵك

٦٦. تــاوانکار سەری ها بــە دارۆ بـیٚ تـاوان کـــلاوی وا بــــە لارۆ

٦٧. تا وەختیٚ ئەمتوانی بخۆم نەم بوو، ئێستا کە هەسم، ناتوانم بیخۆم.

٦٨. تاویٚ گەشم، تاویٚ ڕەشم، تاویٚ شادم، تاویٚ ناشادم.

٦٩. تا هاتم بوو، دونیا ماتم بوو، ئەوسا ئاغە حسەین بووم، ئێستا ئەپلەتسەینم. وەختێـك کە نەهاتم هات، بووم بە گەمە جاڕی وڵات.

٧٠. تریشکە لە خۆی دوو شکە.

٧١. تریٚ ڕەشە، ئاخری خۆشە.

٧٢. تف هەڵی خەیتۆ، ناوچاو خۆت ئەگرێتۆ.

٧٣. تۆپین کەر قەڵەو، زەماوەن سەگە — ئەمە وتاری ئاغاو برا بەگە

٧٤. تۆبە لە گوناح تەرکی مەعاسی — بە قووەت ئەکا حافیزەی ناسی

«نامی»

٧٥. تۆ تاوی فجوق کەری من مەتاوو. «ئەڵێن پیاوێکی فەقیرو سادەی هەورامی، کەوێکی لەسەر بەردێکا چاو پێکەوت، چوو بیگرێت، کەوەکە دای لە شەقەی باڵ و ڕۆیی. پیاوە فەقیرەکە وتی تۆ ئەتوانی باڵ بگریتەوە من ناتوانم، لەسەر بەردەکە خۆی خستە خوارەوە و ملی شکا. ئەم پەندە ئەوە ئەڵێت: تۆش لە قەدو قەوارەی خۆت دەرمەچۆ با وەهات بەسەر نەیەت».

٧٦. تۆ جوێن بە دایك و باوکی خۆت مەدە. «خراپە بە دایك و باوکی کەس مەڵێ تا خراپەی دایك و باوکت نەڵێن». «لە حەدیسەوە وەرگیراوە»

٧٧. تۆ جێگای پام کەرەوە، خۆم جێگای سەرم ئەکەمەوە.

٧٨. توخنی پیاوی سەرچەوت مەکەوە — نە قەرزی بەرێ و نە دوای کەوە

٧٩. تۆ لە بار ڕاسی خۆت لێ ئەخورِی — بۆیە بێ باکی و وا دائەخورِی

٨٠. تووشتبووبە تووش مووی لووتی خۆتۆ — نەجاتت نابێ هەروا لە خۆتۆ

٨١. تۆشەمان گاڵ بوو، زوو بەرەو ماڵ بوو. «بە کەسێك برِوا بە شوێن کارێکاو بۆی جۆر نەبێت وا ئەڵێن».

٨٢. توولێ بە توولی ئەچەمێتەوە. «بەشەر بە مندالّی تالیم ئەگرێت».

٨٣. ئەر تۆیش نەبی بە یارم — خوا خۆی ئەسازنێ کارم

٨٤. تەرازوو شەرمی لە کەس نیە.

٨٥. تەرازووی خوا سەرناکا. «واتە:

سووکی بەرەوخوار، قورسی بەرەوژوور — بە پێچەوانەی تەرازووی مەشهوور

«نامی»

٨٦. تەرِ شۆرو پاك شۆر. «ئەڵێن: پیرەژنێك کچێکی بوو ناوی گوڵبەشان بوو. کاتێك دای بە شوو و ئەیانبرد، بۆی ئەگریاو ئەیوت:

| | |
|---|---|
| حـەو نانی خوارد بە نازۆ | حەوتیشی خوارد بە پیازۆ |
| حەوت بە شیر مانگا بازۆ | دایـکی بـمریٚ گولـّبەشان |

هیچی نەخوارد، بردیشیان

کە سواریان کـرد بیبـەن پـاش حـەوت ڕۆژ ئامۆژگـاری وتـی: ئـا توٚخـوا بیگێڕنـۆ ئامۆژگارییێکی ماوە با پێی بلێم وتی: ڕۆلە ئامان سەد ئامان، تەڕ شۆرو پاك شۆر بە. دوای حەوت ڕۆژ، کچەکە ڕاسپێری ناردە لای دایکی و وتی: دایە ئامان باڵە درێژم بۆ بنێرە، ئەویش گۆچانێکی درێژی بۆ نارد تاکو کاسە و کەویلی پـیٚ بێنێتـە بـەرۆو خۆی هەڵسە و دانیشتنی کەمتر بێت».

٨٧. تەرکی عادەت کە، کە نەخۆشینە — عـــادەتی خـراپ خـــۆی نەخۆشــینە
وەك گەردو تریاك، قومارو دامە — کەی کاری پیاوی ئـــازاو بــــە فـامە

٨٨. تەڕو وشك بە یەکۆ ئەسووتیٚ. «وەختـیٚ دارستانیٚ ئـاور ئـەگرێت، تـەڕو وشـك ئەسووتیٚ، قەهری خوایش هەر وایە بۆ بیٚگوناح و گوناحبار».

تەڕە، تۆلەکەی پیٚ ناگات ئەوەندە هەرزانە.

٨٩. تەزبێحو بەرماڵ ڕیشپانو پرچت — یا چـلــە کێشـان هـەروەکـو ورچـت
قورئان خوێندن و سیواك و عاسا — سـەر تاپـا پۆشیـــن بــەرگی مامــۆسا
هایهو هووی دەروێش، جەزبەو حاڵ سۆفی — قیل و قــاڵ مەلا وەك بەسـری و کووفی
هەموو بـیٚ کەڵکە کـە بۆ ڕیا بیٚ — بۆ بەدەس هـانـیـن مــاڵــی دونـیا بیٚ

٩٠. تەشـی ڕەفیـق ڕیـگەیە — تـەون پێی لـە جیٚـگەیە

«ژن ئەتوانیٚ تەشی ببا لـەگەڵ خۆی و بەدەم ڕێگەوە بیڕێسیٚ، بەڵام بۆ تەون کـردن ئـەبیٚ لە ماڵا نیشتەجیٚ بییٚ».

٩١. تەشی ڕستـن باشتـرە لـە پەسا ڕاخستـن.

٩٢. تەغاریٚ گەنـمیان ئەدا بە کەڵەشێریٚ، ژنـمان تەڵاق نەئەدا.

٩٣. تەکەبــور مەکەر ئەگەر دانـانی — دوو جـار جە ڕاگەی بــەولـۆ ئـامانی

«مەولەوی»

«واتە: فیز مەکە ئەگەر ژیری، دوو جار لـە جیٚگـەی گمیـزی بـاوك و دایکتـۆ هاتوویتـە

دەرەوە».

٩٤. تەماشای کوێت کەم لووت قولقە سوێنە — پیاتا بەرۆ بوو لە هەزار وێنە

٩٥. تەماشا کردن گوڵی هەڵمەڵە — دەوای نەخۆشی و ئازاری دڵە

«نامی»

٩٦. تەماشای لووت خۆت کە با کورەکەت نەکەی بە چاوۆ.

٩٧. تەماع تەجروبەی تیرەی ئینسانە — کە کێ بێ دێنە و کێ موسڵمانە

تۆ تەماع مەکە نەفسو ناموس کەس — ئابرووی خۆت مەبە بۆ هەوا و هەوەس

٩٨. تەماع چی ناورد بە سەر ئینسانا — کۆسە بۆ ڕیش چوو سمێڵیشی دانا

٩٩. تەماعکار تێر نابێ مەگەر بە خۆڵ. «ئەم پەندە لەوە وەرگیراوە کە ئەڵێن: کەسێك لە خەوا تاپۆیەکی دی کە بەردەوام شتیان دەرخوارد ئەدا، بەڵام هەر تێری نەئەخواردو هەر هاواری بوو و ئەیوت برسیمە، هیچیتر نەما، لە ئاخردا مشتێ خۆڵیان کرد بە قورگیاو بێدەنگ بوو. کاتێك خەوەکەی بۆ زانایەك گەڕاندەوە، زاناکە وتی ئەو تاپۆیە، مرۆڤە کە بە هیچ شتێك تێر نابێت مەگەر بە خۆڵ. مەگەر خاکی قەبر تێری کا».

١٠٠. تەماع وا لەولای ئەڕواحەوە. «زۆر ڕێی ئەکەوێ کە ئینسان بۆ تەماع و ماڵی دونیا، خۆی ئەدا بە کوشتن».

١٠١. تەمایەر کەس مەبە، هەر تەنیا بە تەمای زەحمەتی خۆت و ڕەحمەتی خوا بە.

١٠٢. تەمایەر مەبە بۆ چارەسەرت — غەیربازووی خۆتو خودای بانسەرت

١٠٣. تەمبەڵ بڕۆ سەیری مێلوورە بکە، خەریکی ڕزق کۆ کردنەوەیە. «ئەمە فەرموودەی حەزرەتی سولەیمانە(علیه السلام)».

١٠٤. تەمبەڵ غەیب زانە.

١٠٥. تەمبەڵ وتی ئەمڕۆ نەچین بۆ کار ، زەمبەڵ وتی سۆزیش هەر نەچین.

١٠٦. تەمەڵ وەك مردوویێك وایە لە ناو زیندوواندا بێت.

١٠٧. تەمەنای تەمەن درێژی ناکەم — خۆم ڕیسواو ڕووڕەش لای خودا ناکەم

تەمەن درێژی بە بێ عیبادەت — بۆ ئینسان ئەبێ بە هۆی نەدامەت

١٠٨. تەن بدەن بە قەزاو ڕووبکەن لە ڕەزا — ئەمەیە ڕوتبەی ڕەزا بە قەزا

١٠٩. تەنەکە سازی سەر ئێشانی زۆرترە لە دەس کەوتی. «قانع»

١١٠. تەنەکەیەك شیر، مسقالێك هەوێن ئەیگرسێنێت.

١١١.تەنیایی شەوان هەر بۆ من خاسە      خـۆراکـم خەمە و بەرگـم پەلاسە

١١٢. تەنیایی هەر بۆ خوا خاسە.

١١٣. تەور کلك خۆی نابڕێت. «واتە: کەس لە کەس خۆی هەڵناچیّ»

١١٤. تەونێکم بۆ ناوەسۆ، هەر تەواو نابێت.

١١٥. تێر ئاگای لە برسی نیە.

١١٦. تیر ئەتەقێنێت و کەوان ئەشارێتەوە. «فیڵ بازە»

١١٧. تێر کوتایە دوای برسی، هەرزانی هەی هەرزانی.

١١٨. تیر کە لە کەوان دەرچوو تازە ناچێتەوە جێگای خۆی، «قسەش لە دەم دەرچـوو هەر وایە».

١١٩. تێر نەخواردن لە باوك مردن خراپترە.

١٢٠. تیری خوا، تەقەی نایێ کەچی لە هەموو تیرێك بە بڕشت ترە.

١٢١. تێکە و لێکە و کەس لە کەسە. «واتە: کەس بە گوێ کەس ناکات»

١٢٢. تیکە و دەران، کافری وەران. «واتە: کافر موحتاجی مووچە و بەرات بێت، نەك ئێمە»

١٢٣. تیکەیەك نان ماڵ خۆت بە هەزار دەوری پلاّو ماڵ خەڵك ئەژی.

١٢٤. تیکەیێ کەمتـر، برایێ زیاتر      ئاشنا بگرە لە جـاران زیـاتر

١٢٥. تیکەی زل، دەمیش دەدڕێت و قنگیش. «هۆشت بە خۆتەوە بێت».

١٢٦. تینووهیچ‌وەختێ ئاوی لەبیر ناچـێتۆ      هەمـیشـە مـنـیش هـەر وامـە بـۆ تـۆ

١٢٧. تاقانە، یا شێتە یا دێوانە.

١٢٨. تەلاّ کە پاکە، چ منەتی بە خاکە.

***

# پیتی ‹ ج ›

## پەندی پێشینان

١. جا ئەگەر دۆستێ وەك تۆم ببێت، دوژمنم بۆچیە؟

٢. جا خۆ جواب شەق نیە!؟ «ئیشارەیەك بەسە بۆ ژیر».

٣. جا خۆ نانم بە ساجۆ نەسووتاوە، پەلەی پیرە ژن هێنانم چیە.

٤. جاران بێ ساز ئەیژەند، ئێستە خۆی سازێ وا بە دەسیەوە.

٥. جاران پیاوەگەورەکان بۆ گرتنی خەبەرو باس ڕاسپێردەیان ئەنارده لای ژنان لە کانی.
«کەچی ئێستا هەموو کەس لە ماڵی خۆیدا هەموو خەبەرو دەنگ و باسێك ئەزانێت».

٦. جاسووسی لە دەییووسی خراپترە.

«ڕۆژێك کۆمەڵێك خەڵك لە ساڵی ١٣٤٢دا هاتنە خزمەت مامۆستا مەلا باقر، ئەوانە پێنجیان موعەلیم و چواریشیان بەگ زادە بوون. مامۆستا باقر ئامۆژگاری زۆری کردن، ئاخری قسەکانی بەوە هێنا کە جاسووسی خراپترە لە دەیووسی. پاش ڕۆیشتنی ئەوان پێمان وت: بۆچی ئەوەندە توند فەرمووت؟ فەرمووی: ئەمانەم بە جاسووس ئەزانی».

٧. جاسووسی مەکە بۆ پووڵ و پارە ‌ ‌ جاسووس هەمیشە هەر شەرمەزارە
٨. جگەرە توورِ دە برا مەیکێشە ‌ ‌ ڕەگی حەیاتی خۆت دەرمەکێشە
جگەرە جەرگت لەت و پەت ئەکا ‌ ‌ تووش قۆزە و قرخە و سەرەتانت ئەکا
پاش ٢٥ ساڵ ڕەفیقی دووکەڵ ‌ ‌ ئێستا ئاسوودەم لێت ئەکەم تکا
بەدەس خۆت ئاور ئەنێی بە ماڵتۆ ‌ ‌ شێتیش هەر کاری وەکو تۆ ناکا
ئەو پارەی ئەیدەی تۆ بە جگەرە ‌ ‌ تەئمینی گۆشتی مناڵت ئەکا
بیدە بە بەرگ و بیکەنە بەریان ‌ ‌ سەربەرزی دنیا و قیامەتت ئەکا
بیکەی بەخێرو بیدەی بە فەقیر ‌ ‌ دەردو بەلا زۆر لە تۆ دور ئەکا
هەرماڵێك ئەچیت بێزارن لە تۆ ‌ ‌ ئینسانی عاقڵ کەی کار وا ئەکا
جگەرەکە پیربووی بێهێزت ئەکا ‌ ‌ ئیختیاری دواشت لە دەست دەرئەکا

٩. جلمان لەبەر خۆرێکۆ وشك بووەتۆ. «واتە: ئاشنای زووترین»

١٠. جوابی نەزانان هەر بێ دەنگییە ئەمە مۆجگاری شێخی سەعدییە

١١. جوانێك بە پیاوێکی پشت کۆماوی وت: خالۆ سەرت دانەواندوە چیت گوم کردووە و بۆی ئەگەڕێی؟ پیرە وتی: جوانیم گوم کردووە و تازە نایشیدۆزمەوە.

١٢. جوانیمان ڕۆیی و پیری هاتە پێش ئازای ئەنامم هەمووی هاتە ئێش
ئێستا ئەزانم چیم لێ قەوماوە لە لاشەم هێزو ورە نەماوە

١٣. تۆجۆ بکێڵیجۆی لێسەوز ئەبێ گەنم بکێڵی گەنم سەوز ئەبێ

١٤. جۆرێ نان بخۆ هەمیشە بتوانی بیخۆی.

١٥. جۆگەلەیەك ئاوی دەریا لێڵ ناکا، گەورە بە وتەی بچووك هەرگیز دڵی کەیل ناکا.

١٦. جومعە ئەگەر کەسێ بچێتە سەفەرو نوێژ جومعەی بفەوتێنێت، مەلایەکە نەفرەتی لێ ئەکەن.

١٧. جومعە وارۆ، شەممە وەش کەرۆ شەممە بوارۆ، پەنج و شەش کەرۆ
«تەجروبەی هەورامییەکانە»

١٨. جوابی دەهۆل ژەن سرنا ژەن ئەیداتەوە.

١٩. جوان دانیشێ بەلای جوانۆ وەك دوو شەمامەن بە سەر دووکانۆ
٢٠. جوان دانیشێ بەلای پیرەوە وەسە زیندانێ بە زەنجیرەوە

٢١. جوان هەر مەرگی نەبێت، ئازاری جوان وەسە دڵۆپەی بان.

٢٢. جووتێك گورگ یەك گرن، کەس چاریان ناکات.

٢٣. جووجەڵەی بەهار لە پاییزدا ئەژمێردرێت. «پەلە مەکە».

٢٤. جۆی دیوە، کا ناخوات.

٢٥. جەردەی بێسیلاح دوکتۆر ئیمڕۆیە موبتەلای ئەوان هەر ڕەنجەڕۆیە
تالانت ئەکەن بژیت یان بمریت پارەیان ئەوێت، قەیناکا بمریت
تالانت ئەکەن، مەچۆ بۆ لایان هیچ قازانج نابەی تۆ لە دەوایان

٢٦. جەزای چاکە بە چاکە، چاکە و سەهل و ئاسانە
جەزای خراپە بە چاکە، با گرانە، ئیحسانە

٢٧. جەماعەت جەمە، هەر منتان کەمە.

٢٨. جەماعەت و ڕەحمەت. «واتە: ڕەحمەتی خوا لەگەڵ جەماعەت دایە، لە ناویاندا دەرمەچۆ»

٢٩. جەنجاڵ کردنی دەوری نەخۆش، پەلە کردنە بۆ مردنی. «خەفەی مەکەن. ئێستا تەلەفوون هەیە و لە ماڵیشا هەمیشە ئەتوانن ئەحواڵی بپرسن».

٣٠. جەوهەرت وەکوو دەبان ئەتکێ بەڵام زووانت لە ترسا ئەشکێ

٣١. جەهەننەم وتی: وە «هَل مِن مَزید»؟ بۆت مەعلوومئەبێت بەدبەختو سەعید

بەدبەخت کەسێکە بە بێ ئیمانی چووبێتە دەرۆ لە دونیای فانی

٣٢. جەهەننەم لە نیوەیشیا بگەڕێتۆ هەر باشە. «واتە: تۆبە بکە»

٣٣. جیاوازی بخەرە بەین خەڵك و خۆت، ناوجی بکە و ببە بە ئاشتیخواز و ببە بە ئاغایان. «ئەمە شیعاری ئاغای زوو بووە»

جاکەسێك ژیر بێت بەگوێیان ناکات خۆی لە دوو دونیا، ماڵ ویران ناکات

٣٤. جیماعی زۆرزۆر وەکوو پاساری کەم عومری دێنێ، هەم دەردەداری

«نامی»

***

# پیتی ‹ چ ›

## پەندی پێشینان

١. چارە و کارە چوون بۆ دیوان    چـارە هـاتۆ بە پـلـی زیڤـان
کـارە هاتـۆ چـاو بە گریـان

٢. چاکترین جوان کەسێکە ڕەفتاری وەکوو پیران بێت و خراپترین پیر کەسێکە ڕەفتاری منالآنە و هەرزەکارانەی بێت. «ئیمامی غەزالی»

٣. چاك نازانیت، خراپیش مەڵێ.

٤. چاکە بیخەیتە بن گۆم، ون نابێ.

٥. چاکە لـە چاکە ئەبێتۆ. «بۆیە خوایش جەزای چاکەی بە چاکە داوەتەوە»

٦. چاکەت لـەگەڵ خەڵك زوانی ئەبەسێ    بـۆ خـراپ کـاریش دەستـی ئەبەسـێ

٧. چاکەن بۆخەڵکی وا لـە بێخ چاوۆ    ئـۆخـەی وا دڵـم تـەواو حـەسـاوۆ

٨. چاوبازە ناگیرێ.

٩. چاو بە چاو ئەکەوێت و ڕوو بە ڕوو.

١٠. چـاو زۆر کەسـی خـستوەتە نـاو قـەبرو زۆر وشتریـشی خـستوەتە نـاو دیـزە. «حەدیسە»

١١. چاوە ڕاسەکەم، چاوە ڕاو مەکـە    خۆت تووشی دەردی بێ دەرمان مەکە

١٢. چاوەڕێی کەس مەبە، زەحمەت بکێشە و نانی بێ منەت بخۆ.

١٣. چاوەزار، ئەمپارێزێ لـە ئازار.

١٤. چاویان بۆ دیتن داناوە و گوێیان بۆ بیستن.

١٥. چـاوی ڕشـتـووە بۆ گەمـە    سوورزنە لـووتەی سەگ دەمە

١٦. چ باسە؟ هەموو هەر سەری تاسە.

١٧. چ دایەنێ لـە دایك باشترە؟ «هیچ!».

١٨. چرا لـەپشت سەرۆ ڕۆشنایی نادا، «خێرێ ئەکەی بیخەرە بەر خۆتۆ».

١٩. چرایەك پێویستی ماڵت بێ، بۆ مزگەوت حەرامە.

١٩. چرای ناکەسان تا بە ڕۆژ گڕیا  کۆنە وەجاخان ڕێ و شۆینیان بڕیا

٢٠. چرایەك کە خوا هەڵی گیرسێنێ  هەرکەس فووی لێ کا ڕیشییەسووتێنێ

٢١. چرایێ کە خوای گەورە هەڵیکا  ڕیشی ئەسووتێ هەرکەس فووی لێ کا

«وەرگێڕاوە لە شیعری سەعدی»

٢٢. چل خەم، چل خەیاڵ چلیش وەسواسە  سێ چل چۆن دەرکەم بە یەك هەناسە

«مەولەوی»

٢٣. چلکە فیکان ئەزانێ و فرمان کردن نازانێ. «چلکە فیکان = ئەلۆاتی‌یە»

٢٤. چل ماڵ هاوسێ بە دەور یەکا نامەحرەم نین ئەگەر موسڵمان بن. «حەدیسە»

٢٥. چوار برا بوون یەکێکیان لێوی نەبوو پیان ئەوت فوو بکە لە ئاگر. «زۆر نابارە!»

٢٦. چوار فەسڵە خۆشە نە وەك بەهاران  قاسپە قاسپی کەو لە ناو گوڵزاران

«فۆلکلۆری کوردی»

٢٧. چوار مانگە و دە شەوی چی؟ هەفتا ڕۆژە شووەکەی مردووە، مەڵێن پەلەیەسی بۆ شوو.

٢٨. چۆلەکەیش خوایەکی هەیە. «واتە: ڕەحم و بەزەییت ببێت بۆ ئەوانەی لاوازترن»

٢٩. چۆلەکەیش قنگ هەڵئەتەکێنێ. «واتە: دەسەڵاتی هەر ئەوەیە»

٣٠. چۆلەکە لەبەر ئاوا باڵە تەپێ بکا، بە تەجرەبە مانای ئەوەیە کە ئەبارێ.

٣١. چۆلەکەی کوێر، خوا هێلانەی بۆ درووست ئەکات.

٣٢. چۆلەکەیەك لە دارێ کەوتە خوارۆو وتی: چوار کیلۆم کەم کردووە ئەوەندە ترساوم، وتیان تۆخۆت دە مسقاڵ نابیت، چۆن چوار کیلۆ کەمت کرد؟ وتی: هەرکەس سەنگ وەمەنی خۆی.

٣٣. چۆنی لەبۆ خۆت واش بە بۆ خەڵکی  ئەوکاتە پیاوی باش و بەکەڵکی

«لە حەدیسەوە وەرگیراوە»

٣٤. چوومە چەمی چەق چەقان  چەقەڵ چەڵتووکیەتەقان

٣٥. چوومە سەیر ماڵی میران  کارەکەر، کارەکەرمەگیران

٣٦. چوومە ماڵی جوولەکە قوڵتە قوڵتی کوولەکە

٣٧. چوومە ماڵی موسوڵمان دەنگی یاسین و قورئان

٣٨. چووی بۆ دوور، بووی بە پوور.

٣٩. چوویتە شارکوێران، دەس گرە بەچاوتۆ ئەگەر تالیبی ڕەسم و یاسای تۆ

٤٠. چ دڵێك بێت و خەم نەبێ تێیدا مەر کەلاوەی کۆن، کەس نەچێ پێیدا

٤١. چەقۆی لێنێی، خوێنی نایێ. «ئەوەندە داخ لە دڵە»

٤٢. چەڵتووك حەز ئەکات بنەکەی لە ئاو بێت و سەرەکەی لە ئاگرا، بۆیە لە گەرمیانا بڕشتی زۆرە.

٤٣. چەم بێ چەقەڵ نابێت، بێشەش بێ شێر.

٤٤. چەن خۆشە ئاشتی لەدوای قاروقین تۆبە پاش کوفری «ربّ العالمین»

٤٥. چی بکەم من لە دەس کارەکان گەردوون شاڵینە لە کۆڵ لێم بووە بە خاتوون

٤٦. چێشت خۆش، بۆ نەخۆش.

٤٧. چۆلەکەیەکی یەك ساڵانە، دوو ساڵانەیەکی خڵەتاند.

٤٨. چۆنەر تا تەنك بێت، سەلکی قەوی‌ترە.

٤٩. چۆنەریش خۆی بە مێوە دائەنێ. «داخم ئەوەیە».

***

# پیتی < ح >

## پەندی پێشینان

١. حازر خۆری و قەراخ نشینی بۆ کەم کەس دەس ئەدا بە چاو بیبینی.

٢. حازر لە قەرز باشترە. «بۆیە وتراوە: بیدە بە هەشت، بیگرە لە مشت، مەیدە بە دە و بۆی بکەویتە دەو»

٣. حاشا لە ماڵ گەن، کەس ناڵێ بە چەن.

٤. حاشا لەو خوێنە شەوی بەسەر هات.

٥. حاشا لەو قافڵە پێشاهەنگی کەر بێت.

٦. حاکمێ ناردی بە شوێن حەکیمێکا کە بێت بۆ لای. وەختێ هات، حاکم وتی: حەکیم بۆچی دیارت نیە؟ حەکیم وتی: تا تۆ ئەوەندە بە دەمار بیت و منیش بە قەناعەت، کەمتر چاوت بە من ئەکەوێت.

٧. حوکمی مناڵ لە حوکمی شا توند ترە، «بۆیە پادشایێ وتوویە: بمبەنە جێگەیەك کە لە خۆم گەورە تری تیا نەبێ. واتە مناڵی تیا نەبێ».

٨. حەج وا لەبەر دەرگای خۆتا، فەقیردێتە بەر دەرگات باش برۆ بە دەمیەوە.

٩. حوکمی حاکمە و مەرگی موفاجات — چارەی هەر نیە مەگەر بە مەمات

١٠. حەز ئەکەی چەقۆ بە دەستۆ هەڵ بێ — نقورچك بگرە لە دۆم، هەرجۆر بێ
چوون ئەوان خەریك سیرمە و کلاشن — بۆ چەقۆو هەسان وەسایێ باشن

١١. حەسوود هیچ جۆرێ بۆت ڕازی نابێ — هەتاکوو نان و نیعمەتت مابێ
«ئەم ئیشارەتە وتەی سەعدییە — ڕاستی فەرمووە و هیچ شکێ نیە»

١٢. حەقێکت هەیە حەواڵەی خوای کەیت — حەقت ئەسێنێ و خۆت ڕزگار ئەکەیت
یا لە خەزنەی خۆی جێبەجێی ئەکا — هیچ ئازارێ ئەو لە سەر تۆ ناکا
یا ئێحسانی ئەو ئەنووسێ بۆ تۆ — یا عەزابیەدا لەسەر حەقی تۆ

١٣. حەکیم خاس تەنیا خواس.

١٤. حەوت کچ کوێری پیێ، هەموویان بە شەویێ ئەدا بە شوو. «ئەوەندە لـیێ زان و خۆش مامەڵەیە»

١٥. حەوت کفنی زەرد کردووە. «ئەوەندە ترساوە»

١٦. حەوتی بمریێ لە باوان کلەی نابڕیێ لە چاوان

١٧. حەیادار لە حەیای خۆی ئەترسیێ، بیێ حەیا ئەڵیێ: لە من ئەترسیێ.

١٨. حەیفە شتی خۆش بۆ نەخۆش، کە تەبیعەتی نایبا.

١٩. حەیفە لۆتی بمرێت تۆ بمێنی، لە لۆتی بیێ حەیا تری.

٢٠. حەیوان گوتویەتی: بکەومە چاڵ بەو شەرتەی ساحێبەکەم چاوی لێمەوە بێت.

٢١. حەیوان لە دوای حەیوان نەفرەت ئەکات، تەنانەت نێرەکەر لە نێرەکەر. کەسێك ئەو کارە بکات لە کەر پیس‌ترە. «تایفەی حەزرەتی لوت‌ﷺ ئەو کارەیان ئەکرد، بۆیە خوای گەورە تەفرو توونای کردن».

٢٢. حیجاب و شەرم و حەیا زینەتە بۆ ژنانە بیێ شەرمی‌و بیێ‌حەیایی ئاوات دڵی شەیتانە

٢٣. حیزی بە دەسەوام ناژمێرریێ.

٢٤. حیز، بە خاڵۆی خۆی فێرە.

٢٥. حەزرەتی نوح‌ﷺ ١٠٤٠ ساڵ عومری بوو. لە زنجێکا ئەژیا. وتیان پێی بۆ ماڵ ناکەیتۆ؟ وتی: عومری کۆتای دنیا بە کار ئەوە نایێ ماڵی بۆ بکەیتەوە. وتیان: لەم هەموو عومرە دنیات چۆن هاتە بەرچاو؟ وتی: دنیا وەسە ماڵی دوو دەرگا، لەمیان دێیت و لەویان ئەچیتە دەرۆ.

***

# پیتی < خ >

## پەندی پێشینان

١. خاسە بکە و خراپە مەکە. «ئەم پەندە لەوە وەرگیراوە کە ئەڵێن: پیاوێکی جاف چوو بۆ خزمەتی مامۆستای دەرس بێژی حوجرەی بیارە، مەلا قادری گەورە، ١٥ فەقێی لە دەوردا بوو و خەریك بوو دەرسی پێیان ئەوت و کتێبی زۆر لەبەر دەمیاندابوو. پیاوە جافەکە ڕووی کردە مەلای گەورە و پرسی: مامۆستا ئەم کتێبانە ئەڵێن چی؟ مامۆستا نەیزانی کە چۆن وەڵامی بداتەوە چونکە کتێبەکان هەرکام لە بابەتێك بوون و نەشئەبوو بە کابرا بلێت. چوون تێ نەئەگەیی و بۆی حاڵی نەئەبوو. پیاوەکە وتی: مامۆستا زەحمەت مەکێشە خۆم ئەزانم، هەر هەموویان ئەڵێن خاسە بکە و خراپە مەکە. مامۆستاش فەرمووی بەڕاستی هەر وایە کە تۆ فەرمووت».

٢. خاسی بخەیتە بن گۆم، گوم نابێت.

٣. خاسی، لە خاسی خەڵك ئەبێتەوە     هەتاکوو دونیا ئەبڕێتەوە

٤. خاسی خەڵك بلێ لە پاش مردنی     باشترە هەتا غەیبەت کردنی

٥. خاکت بە ڕەنجت بکە بە کیمیا     بیکە بە گەنم، یان بە لۆبیا

بە ڕەنجی شانت نان خۆ، تا ماوی     ئیتر بە پیریش هەر گەنج و لاوی

تۆ کەشاوەرزی بکە بە پیشە     قایمکە لە عەرز، هەم ڕەگ، هەم ڕیشە

٦. خاك لە ئەمانەت خەیانەت ناکا.

٧. خاکی بەر پێی بۆ حەوت دەرمان ئەشێ. «ئەوەندە پیاوچاکە»

٨. خاکی سەر قەبران مەبەرۆ بۆ ماڵ     ئەگەر پاشا بی، ئەبی بە حەماڵ

«نامی»

٩. خاڵۆی ترۆزی ئەمرۆ نە، سۆزی.

١٠. خاڵۆی دەستەوسان، خوای گەرمیان و خوای کوێستان.

١١. خاڵۆی هەوانە لە پشت، ئێمە بە خواو ئێوە بە گشت.

١٢. خانم لە عیراق، خان لە ئێرانە — ئەمە بۆ ئێمە جێی سەرسوورمانە

١٣. خانم و خان و خاتوون — لە یەك كارخانە دەرچوون

١٤. خان نیسبەت بەم لە گیانم — فەورەن ئەبێ بە خانم

١٥. خان «توو» بخەیتە ناوی — ئەكرێ بە خاتوون ناوی

١٦. خانمێ بوو سەرسەری — دانیشتبوو لە پێنج دەری

پشیلە هات گۆشتەكەی بەری — عاری لێ هات ختەی كەری

١٧. خانە بە خەنە، شەهاب بە مەزاق — حەیدەر بە درۆو فەتالی تەلاق

١٨. «حاكمی وەختی سنە، نۆكەرێكی ژیری ناردووە بۆ تاقی كردنەوەی سەرۆك عەشیرەكانی مەریوان. لە گەڕانەوەدا بە حاكمی وتووە: خانە بە خەنە، شەهاب بە مەزاق، حەیدەر بە درۆ و فەتالی تەلاق. خانە: باوەگەورەی بەگەكانی شێخەكوێرە بوو. شەهاب: باوەگەورەی كۆنەپۆشییەكانە. حەیدەر: باوەگەورەی هۆزی حەیدەر بەگی. فەتالی: باوەگەورەی فەتالی بەگی».

١٩. خاوەن ماڵ دەستی هەڵگرت، دز دەست بەردار نیە.

٢٠. خەزێنەی باش زانینە، تا بەشی خەڵكی لێ بدرێت زۆرتر ئەبێت. «كەوایە درێغ لە خەڵك مەكە».

٢١. خزمان گۆشتی یەكتر بخۆن، ئێسقانی یەكتر ناشكێنن.

٢٢. خوا ئاگای لە خشەی مارو چرپەی مێروولە هەیە، «هۆشت بە خۆتەوە بێت».

٢٣. خوا بار لەكەس نەنێ، باری گرانە.

٢٤. خوا بدا مەرگم، زاوا نەكا بەرگم.

٢٥. خوا بكا ئەم دەس موحتاج ئەو دەس نەبێ.

٢٦. خوا بكا هیچ ماڵێ بێ گەورە نەبێ.

٢٧. خوا تا كێو نەبینێ بەفری بە سەردا نابارێنێ. «یا:

خوا هەرگیز كاری نابەجێ ناكا — تا كێو نەبینێ بەفری تێ ناكا»

٢٨. خوا بە ڕەحمی خۆی خراپتر نەكا — ئەرنا هەڵئەگرین هەرچیكمان لێ كا

٢٩. خوا ئەگەرحەزكات عەبدی بێ خۆشحاڵ — لەبۆی ئەنێرێت گەوهەری ئیقباڵ

٣٠. خوا پێی‌نەدا بە مارو شاخی‌نەدا بە کەر — با خەڵکی بژین بە بێ دەردی سەر

٣١. خوا تەختە تاش نیە، تەختە ڕێك خەرە — هەرچی کەین بێ ئەو، گشت بێ سەمەرە

٣٢. خوا بە سەبر ئەیکات و بە زەبر ئەیکات.

٣٣. خوا پشیلەی ناسی باڵی پێ نەدا، کەری ناسیوە شاخی پێ نەدا.

٣٤. خوا چوار وەرزمان لێ نەگۆڕێت، «چونکا هەر وەرزێك سەیرو سەفای خۆی هەیە».

٣٥. خوا حەقی بزنی کۆڵ بە سەر بزنی شاخدارەوە ناهێڵێت.

٣٦. خوا دەردێك ئەدات لە تاقەت دەرچێت.

٣٧. خوا دەرگایەك ئەگیرێنێت، هەزار دەرگای‌تر ئەکاتەوە.

٣٨. خوا دێر گیرە و سەخت گیر.

٣٩. خواردن و خەوتنی زۆر، تەمەڵی و نەخۆشی دێنێ.

٤٠. خوا ڕیشێ پان و زوبانێ لووسم پێ بدات، ڕزقی خۆم لەسەر خۆمە. «ئەڵێن ئەم پەندە پاوەیی وتویانە»

٤١. خوا زیادی کا بەقایە، تێرمان نەخوارد چ فایە.

٤٢. خوا سەر خۆش کات، کڵاو زۆرە.

٤٣. خوا سەرما بە ئەنازەی ماڵ ئەدات.

٤٤. خوا عەقڵی بە خۆت نەداوە، تا بیدا بە منداڵەکانت.

٤٥. خوا فەرموویە لە قورئان: «اَلطَّلاقُ مَرَّتان»

بڵێین بە قەومی کوردان — عەیبە بە حەقی قورئان

ژن هێنان و تەڵاق دان — ژن هێنان و تەڵاق دان

«حاجی قادر کۆیی»

٤٦. خوا قاڵاو نیە چاوی کەس کەنێ — کێو ئەبینێت و بەفری لێ ئەنێ

٤٧. خواکەی سەبەب ساز، سەبەب سازەنی — پادشای گەورە و بێ نیازەنی

دەردم دەوا کە، پەنام هێناوە — نەجاتم بدە لەم دەردو داوە

٤٨. خوا کڵاو بۆ بەڕوویش درووست ئەکات، «ئیتر خەمی چیتە».

٤٩. خوا کە ویستی کارێك بکات، ناپرسێت عەلی کورِ کێیە؟.
٥٠. خوا گەر حەز بکا عەبدێکی خۆی بکا بە خۆشنوود، ئەنێریٚ بۆی لە رِێگـەی دوور گەوهـەری مـەقسوود.
٥١. خواگیان کەم بیٚ و بە کەرەم بیٚ. «بە تاقانە وا ئەڵێن. ئەمە پەندیٚ ترە: کـەمی بـە بەرەکەت، باشترە لە فرەی بیٚ بەرەکەت».
٥٢. خوا گیان هەرکەسێك تۆی نیە، چی هەیە؟ هەرکەسیش تۆی هەیە، چی نیە؟
٥٣. خوا لـە جەهەننەمدا ئاشێکی ناوەتۆ سەری مەلای ئاخر زەمانی پیٚ ئەهارِیٚ؟
٥٤. خوا لـە سولّتان مەحموود گـەورە تـرە. «ئەم پەندە لەو داستانەوە گیراوە کە ئەڵێن: سولّتان مەحموو وتی بە نەجارِێك (دارتاشێك) تا چل شەوی‌تر دە عەدلٚ ئاردە مشارم لێت ئەویٚ، ئەگەرنا ئەتکوژم. نەجارِەکە ئەیزانی بۆی جۆر نابێت خۆی بـیٚ خـەیاڵ کـردو بـیٚ خەم لـەماڵەوە بۆی دانیشت. هەموو کاتێك ژنەکەی پێی ئەوت: پیاوەکە هەولێك بـدە، لـە ماڵەوە دامەنیشە، ئەویش ئەیوت ژنەکە خـوا لــە سـولّتان مـەحموو گـەورەترە. «چـل شەوەکە تەواو نەبوو سولّتان مەحموو مردو نەجارِەکەش نەجاتی بوو».
٥٥. خوا لـە شەرِی شەیتان و لـە فیتنەی ئاخر زەمان و بـەڵای ناگـەهان و ژنـی سـەڵیتە لامان بدات.
٥٦. خوا لـە کەس لارۆ نەبیٚ، دەردی گرانە.
٥٧. خوا لـەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە یارمەتی خەڵك ئەدەن.
٥٨. خوا لـە هەموو کەس باشتر ئەزانێت. «لـەوانەیە ئێمە نەزانین قازانج و زیانی برِێك لـە کارەکانی خۆمان کامەیە».
٥٩. خوا ماڵت بە قورِگی زاڵم و دوکتۆردا نەکات.
٦٠. خوا مولکی خۆی چۆڵ ناکات بۆیە بنۆڵ (بن دۆڵ) ئاوەدانە. «بنۆڵ نـاوی ئاوایێکـە لـە هەورامانی شامیان لـە ناو تاش و بەردا ئاوەدان بووەتەوە. ئەڵێن لـە ساڵی ١٣٧٨دا بە هۆی بیٚ ئاوییەوە، تەنەکەیەك ئاویان ئەسەند بە سەد تمەن».
٦١. خوا مەلایەکەیەکی درووست کردووە و بەردێکی داوە بە دەستیەوە کە بیدا بەسەر کەسێکا کە لـە عەقڵی خۆی رِازی نەبێت، بەڵام لـەو کاتەوە درووستی کـردووە هـەروا

بەردەکە وا بە دەستیەوە و کەسێکی پەیدا نەکردووە.

٦٢. خوا مەلایەکەیەکی هەیە کە هەمیشە بەم جۆرە زیکری خوا ئەکات: پاکی و بێ عەیبی بۆ خودایێکە کە زینەتی داوە بە پیاوان بە بۆنەی ڕیشەوە و زینەتی داوە بە ژنان بە بۆنەی زولفەوە.

٦٣. خوا هەر کاتێك بیەوێت کارێك ڕێك بخات، ئەسبابەکەیشی بۆ دابین ئەکات.

٦٤. خوا یار بێ، با دونیا هەر مار بێ.

٦٥. خوای گەورە ئەوەی لە منت ئەوێت، حەقی خۆتە، ئەوەش لە منت ناوێت ڕەحمی خۆتە.

٦٦. خوای گەورە حازرو نازری ڕەفتارو کرداری هەموو کەسێکە.

٦٧. خوای گەورە لە ئەنجەڵ لام بدات، مەنجەڵم ناوێت.

٦٨. خوای گەورە هێزی گەورەیی خۆی بە خولقاندنی شتی نایاب و عەجایەب پیشان ئەدات. «بۆ ڕاستی ئەم پەندە لە ڕۆژی دەیەمی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی لە ئاوایی «پێلە»ی مەریواندا بزنێك کارژەلەیەکی بوو کە سەرو دەم و چاوو سینەی لە ئینسان ئەچوو و لە سینەی بەرەو خواریش لە کارژەلە. ئەم ڕووداوە وێنەی لێ گیراوەو بە خەڵك نیشان دراوە. وە ئێستاش زۆربەی ئەو ڕووداوە سەر سوڕ هێنەرانە بە زۆری فیلمیان لێ گیراوەو کەم کەس نەیدیبێتن. بەڵام کەم کەس ئیمانی لەم بارەوە هێقم و مەحکەم کردبێ».

٦٩. خوا یەکە و پێغەمبەر هەزار نیعمەتی زۆرە و نایەتە ئەژمار

٧٠. خۆپەسەندی عەیبێکی زۆر گەورەیە، «ئامان تۆ نەت بێت».

٧١. خۆتان مەپۆشن لە بای بەهاری با نەشوو نما بکەن یەکجاری

٧٢. خۆت لادە لە ژنی پیری بەد ڕۆخسار تەئسیری ژەهری پیسترە لە مار

«نامی»

٧٣. خۆت بکوژی لە ڕێگای بۆرە پیاوا، ئەڵێ بە دەردی خوایی مرد.

٧٤. خۆت لامەدە لەو خێرە واز لە نۆکەری بیرە

هەتا زوو چی بە دەمێۆ هێشتا هەر ئەڵێن دێرە

٧٥. خۆت مەکوتە جەوتە. «دوو نەفەر بۆ سوالْ ئەچنە دێیەك، تەماشایان کرد ژنان تیانەیەکی زلیان لەسەر ئاور ناوە. وایان زانی چێشت و شتی وایە. یەکێکیان بە پەلە ڕای کرد، کە تەماشای کرد تێگەیشت کە ئەوە وا لە ناو تیانەکە دا، جەوتە و بۆ ڕەنگ کردنی مەشکە ئەیکولێنن. بانگی لە هاوڕێکەی کردو وتی: خۆت مەکوتە جەوتە».

٧٦. خۆت مەخە داوی شەیتان — دوور بە لە مەکری ژنان

٧٧. خۆت مەدە بە دەم خەم و خەیالۆ — دانیشە بێ خەم، بۆخۆت لە مالۆ

٧٨. خۆت مەکە بە پەن، داردەس کەس مەبە — ڕیسواو شەرمەزار حوزوور کەس مەبە

٧٩. خۆت مەکە بە گالتەی خەلك — بە قسەی پووچ و بێ کەلك

٨٠. خۆت ناشیرین مەکە لەبەر چاوی خەلکدا با گوێت لێ بگرن.

٨١. خۆ جواب شەق نیە، «کە وتی فلانە شتت پێ نادەم دەس هەلگرە».

٨٢. خۆ خۆت ئەزانی هۆزی حسەینیم — هەر خۆت بە قوربان تیکەی نیو مەنیم

٨٣. خودا ئینسانی بۆ کار درووس کردووە، ئەگەر کارێ بۆ خۆت نەدۆزیتۆ، خەیالْ لە ڕێ لات ئەدا.

بڕۆ کار بکە کابرای بێکارە — سەربەرزی بەشەر بە ئیش و کارە

٨٤. خودا بدا نیازم — حەوت ژنت بۆ ئەخوازم

یەکێ ئالْ و والا بێ — یەکێ نیمچە بالا بێ

یەکێ زەردی بەر کولێن — یەکێ تیکە هەلگلێن

یەکێ تورکی تەماشا — یەکێ دوختەری پاشا

یەکێ ئەونە جووان بێ — لەمانە بکا حاشا

«دایکێ بۆ کوڕەکەی ئەم دەسە شیعرەی وتووە»

٨٥. خودا خۆی قینی لە کەس نیە، ئەگەر سزای کەسێك بدات خەتای بەد ڕەفتاری خۆیەتی.

٨٦. خودا لە نالدارو بالدار بمانپارێزێت. «مەنزوور حکوومەت و سوون و کولەیە».

٨٧. خودا مامەلە لەگەلْ دلا ئەکات، هەرکەس نیەتی لەگەلْ خوا بێ جەزای لەسەر خوایە.

٨٨. خودا ناسی بە دڵە بە زار نیە. «زار: دەم و زبان»

٨٩. خۆ دوای تۆ ئالآیی و کوتەڵت بۆ ناکەم. «زوو کەسێك بمردایێ، بەرگ و لیباسەکەیان ئەکردە کۆتەڵ و ئەیاندا بەسەر زینی ئەسپێکداو ئەیانگێڕاو بۆی ئەگریان و ئەیان لاواندەوە، بەمەیان ئەوت: ئالآیی و کۆتەڵ».

٩٠. خۆ دەستت لە خەنە نەگیراوە، بۆچی ئیش ناکەیت.

٩١. خۆراکت خەم بێ، بەرگت پەلآس بێ
بە شەرتێ هاوسەر شەوانت خاس بێ

٩٢. خۆزگا ڕەحمیخوا وەختێ بەش ئەکرا
بە گوێرەی گوناح خەڵکی بەش ئەدرا
با بەشم زۆرتر لەو ڕەحما بووایێ
هەموو گوناحم لە بتەین بچوایێ

٩٣. خورما لە بەنەنم زۆرە، جا بە ئێمە چی.

٩٤. خۆزگا ڕێواس بەدەم من بجاواییێت و بڕوایەتە سك گۆران، شنگ بە دەم گۆران بجاواییێت و بڕوایەتە سك من.

٩٥. خۆزگە بەو کەسە بە کچی شووت پێ کردووە. «پیاوی فێلآوی بە بێوەژن وا ئەڵێت»

٩٦. خۆزگە بەو کەسە خوای لێ ڕازیە
مەلایە، شێخە، بەگ، یان قازیە

٩٧. خۆزگە بەو کەسە کە خۆی ئەناسێ
خۆی ناخاتە ناو هیچ دەنگ و باسێ

٩٨. خۆزگە بەو کەسە کە خەڵك لە دەست و پێ و زمان و دڵ و فکری ڕازی بن. «لە حەدیسەوە وەرگیراوە»

٩٩. خۆزگە بەو کەسە نەیناسیوە. «بۆ کەسێك ئەمە ئەڵێن کە مردووە یان زۆر چاکە یان زۆر خراپ»

١٠٠. خۆزگە بەو کەسەی کاری بەکەڵکە
بە زمان و حاڵێ، کۆمەکی خەڵکە

١٠١. خۆزگە دایکت لە جێی تۆ مارێکی بوایێ
با گیرم بە دەستۆ نەخواردبایێ

١٠٢. خۆزگە دایکی عومەر، عومەری نەبوایە. «ئەم خۆزگە، حەزرەتی عومەرﷺ فەرموویەتی، ترساوە لە ئەرکی قورسی ڕابەرایەتی موسوڵمانان».

١٠٣. خۆزگەمان بە کفن دزی پێشوو کە هەر کفنەکەی ئەبردو بێ حورمەتی بە مردووەکە نەئەکرد.

١٠٤. خۆزگەم بە خۆم کەرم نیە بۆ کاو بۆ جۆی خەمم نیە
١٠٥. خۆزگەم بەو کەسە منالّی نیە تا لەم زەمانە سەرقالّی نیە
١٠٦. خۆشە ئاور خۆشە دوو برایش خۆشە، نەك وەك شوو

«ئەلّێن: ژنێك لەگەلّ براکەیدا لە سەفەردا ئەبن. ژنەکە لە ڕێگادا سەرمای ئەبێ، براکەی داری تفەنگەکەی ئاور ئەدا تاوەکو خۆشکەکەی گەرمی بێتەوە، ژنەش کە گەرمی بووەتۆ ئەمەی وتووە...»

١٠٧. خۆزگە مرۆ بەرلە هەموو کەس خۆی بناسیایە، جا ئەو جار باشتر خوای ئەناسی. «لە حەدیسەوە وەرگیراوە».

١٠٨. خۆشەویستی منالّ وا بە هۆجەنەکەی کەماوە.

١٠٩. خۆشەویستی بەڕاستی لەکە لە دلّ لا ئەبا.

١١٠. خۆ گۆشتی گەردە مل نیە، لە کۆلّ نەکەوێ. هەر ژن موشتەری زۆرە.

١١١. خولکەکەی، پاوەیی‌یانەیە. «ئەلّێن ماموستا مەولەوی ئەڕوات بۆ پاوە بۆ سەردانی دۆستێکی، پاش چەند ڕۆژ مانەوە خواحافیزی لە دۆستەکەی ئەکات، دۆستەکەی ئەلّێت: مەولەوی پەلەت کرد، من کاوڕێکم دانابوو بۆتی سەر ببڕم. مەولەویش وتی: مادام کە وایە دلّت نایەشێنم و پاشان گەڕاوەتەوە و کاوڕێکی پێ سەر بڕیوە... ئیتر ئەوەلای لەسەر خوێنەران».

١١٢. خولکی تووڕکیم بکە، بەلاّم خولکی چناریم مەکە. «یانێ: خولکی باشم بکەو بپێچیە پێمەوە وەك دڕکی تووڕك، نەك بە لا دەمێکەوە وەك سافی چنار...».

١١٣. خۆلّم لە کۆش کە و بە سەرم کە.

١١٤. خولە خۆڕایی مەبە . «لە کوردەواریدا بە مەحموو ناو ئەلّێن: خولە».

١١٥. خۆ ماس نیە بە دەمتۆ دیار بێ.

١١٦. خۆم کردم بە خۆم سەنگ بارانم کەن ویلّ و دەربەدەر نێو شارانم کەن
«فۆلکلۆر»

١١٧. خۆگربن لەبەر مەینەت و زەحەت تا ئەکرێتەوە دەروازەی ڕەحمەت
«نامی»

١١٨. خوێندنی قورئان سەرچاوەی نوورە بێ نـوورە هەرکەس لـە مەعنای دوورە

«نامی»

١١٩. خۆی لێرە نیە، خوای لێرەیە. «واتە: خوا لـە هەموو شوێنێك حازرە و خۆشی لـە غەیبەت کردن نایەت».

١٢٠. خوێندنێك کە نەبێتە هۆی زیاد بوونی دین و عەقڵ و ئـاوەزو تەجروبـە، توورێـك ناژێت.

١٢١. خەتا گردە، بە کۆڵ کەسۆ ناوێسێ و کەس ناچێتە ژێری.

١٢٢. خەتەنـە فـەرزە نـەك لــە بــنا قـسەت بـە تەئـسیـرە، نـەك لــە منـا

١٢٣. خەجاڵەت خۆم چیمکرد بـەخۆم کـە تــۆم کـرد بــە ڕەفیقــی خــۆم

١٢٤. خـەرمـان کوتانن کار بزن نیـە گــای ئەوێ برا، خۆ شـۆخـی نـیــە

١٢٥. خەر بەستە، خاوەن ڕەستە.

١٢٦. خەرج زەماوەن و بەنایی، حەزرەت عەلی زامنیەتی.

١٢٧. خەریکم ئەتەقێمۆ.

داوای عەفوو عافیەت ئەکەین لە خـوا تا ماوین

بۆ ڕەحـمی عموومی ئەو تا ماوین، هەر داماوین

١٢٨. خەریکم وەك فیشەك ئەچم بە حەوادا. «ئەونە خەمبارم».

١٢٩. خەریکی چاك کردنی عەیبی خۆت بەو عەیبی خەڵك مەڵێ.

١٣٠. خەسار لـە نیوەشا بگەڕێتەوە، هەر باشە.

١٣١. خەسوو بۆ پیاو بە جووتێك گا دانراوە، بۆ ژن بە دوژمن.

١٣٢. خەسووت خۆشی گەرەك نەبوو، بۆیە تا تۆ هاتی بەشت نەمابوو.

١٣٣. خەسووم عەمری نەمێنێ بەیانی زوو هەڵمە ئەسێنی

ئەچــێ ئـاوم پــێ ئێنــێ

«ئەمە وتەی ژنێکە، زووتر بووك بە دەس خەسووەوە ئەینالان، ئێستا خەسوو بەدەس بووکەوە ئەناڵێنێ، لەبەر بێ عورزەیی کوڕ».

١٣٤. خەڵکی ئەڵێن چیم کردووە کە خوا ئاوام پێ ئەکا. «من ئەڵێم چیم نەکردووە کە خوا ڕەحم پێ ئەکات».

١٣٥. خەڵکی زوو توولّ پەرەست بوون، بەڵام خەڵکی ئێستا پوولّ پەرەستن.

١٣٦. خەڵکی سەگ لێی ئەوەڕێ، من پشیلە. «ئەوەندە کەم بەختم»

١٣٧. خەم بوو بە نانم، خەم بوو بە بەرگم     خەم بوو بە دەرزی، چەقیە نێو جەرگم

«فۆلکلۆری کوردی»

١٣٨. خەم خەمی کردووم وەکوو گۆچانم     وا ئێستا قەدری جوانیم ئەزانم

خەم بوو بە نانم، خەم بوو بە بەرگم     خەم بوو بە نەشتەر، کونی کرد جەرگم

١٣٩. خەم و خەفەتت بە بەدەم باوۆ     دانیشە بە لای کەرەم خواوۆ

«واتەی کوردی جاف بووە»

١٤٠. خەمی زۆرم هەس، جێم نیە تێی کەم     مەر بە بای شەماڵ پەڕەوازەی کەم

١٤١. خەم هات و بە زۆر دەرگای پێ گرتم     بۆیە هەژارو کزو دەست کورتم

١٤٢. خەم و خەیاڵ و خەفەتی دڵم     هەر لەگەڵمایە و دێتە ناو گڵم

«فۆلکلۆری کوردی»

١٤٣. خەم و خەفەت نەبێ هیچم نەخواردووە. «ئەڵێن ژنێك هەموو ڕۆژێك کە بەیانی شووەکەی ئەڕۆی بۆ کێو بۆ کار کردن، دوو کولێرەی زۆر گەورەی ئەکردو چەوری ئەکردو ئەیخواردو ئێوارە کە شووەکەی ئەهاتەوە، ئەیوت: پیاوەکە بە خوا تۆ لە ماڵ دەرچووی خەم و خەفەت نەبێ هیچم نەخواردووە»

١٤٤. خەم نابێ بە نانو ئاو بۆ هیچکەس     خۆت لە پێ مەخە بە خەمۆ بۆ کەس

١٤٥. خەم و خەفەت و ماتی، هیچ دەردێ دەوا ناکا

هەرکەس کە ژیر و ژوولە، بڕوا کارێ پەیا کا

١٤٦. خەنجەری تەنگانەیە. «دوو پیاو بوو بە شەڕیان و یەکیان ئەویتری نا ژێرو دەستی کەوت لە خەنجەرێك کە بە بەر سکیەوە بوو. پێی وت: ئەمە چیە؟ وتی: خەنجەرە، وتی: بۆ چیتە؟ وتی: بۆ کاتی تەنگانەیە. وتی: جا لەمە تەنگانەتر هەیە؟».

١٤٧. خەوتنی شەو خەجاڵەتی ڕۆژی بە دواوەیە. «کەسێك کە لە تاقی کردنەوەکاندا (امتحان) قەبووڵ نەبێت ئەم پەندە بۆ ئەوە».

١٤٨. خەوت و مرد.

زۆر کەس خەوتووە و هەڵنەساوەتۆ     هیچکەس لەم دنیا نەحەساوەتۆ

١٤٩. خەوتووکەی خەوتوو خەوەر ئەکاتۆ     گوناحی خەڵکی مەخەرە ئەستۆ

١٥٠. مەڵێ فلانە کەس شێخی کامڵە     حەلالی گرێی هەموو موشکڵە

١٥١. خەوی بەربەیان کەم ڕزقی دێنێ. «حەدیسە»

خەوی بەیانی تا خۆر ئەکەوێ     هەرکەسێ بیکا، نەگبەتی ئەوێ

«نامی»

١٥٢. خەیاڵ پلاوە، با چەورتر بێت.

١٥٣. خەیاڵ خاو مەکە. «خاو بە مانای بەتاڵ، مانایەکی‌تریشی ئەوەیە کە خاو دێیەکە لە مەریواندا کە زەوی و زاری بەپیت و بەرەکەتی هەیە، خەڵك ئاواتی لێ ئەخوازن».

١٥٤. خێر بۆ خوێش نەك بۆ دەروێش.

١٥٥. خێر خاوەنی خۆی دەدۆزێتەوە.

١٥٦. خێرو شەڕ هەردووکیان لە سەر زەوی دان، خەتای خۆمانە ئەگەر ڕێگای شەڕ ئەگرینە بەر.

١٥٧. خێر هاتووە بە پیریتۆ، خۆتی لێ لامەدە.

١٥٨. خێرو چاکە، بیخەیتە بن گۆمیش، هەر گوم نابێت.

١٥٩. خێری خۆت لەگەڵ خۆت بەرە لە بۆ گۆڕ     مەیخەرە ژێردەس مناڵ میرات خۆر

١٦٠. خێر بە بە خۆیشت مەیدە بە دەروێش     لایە لە ڕێتا نەخۆشین و ئێش

١٦١. خیگە بە دارە، وەرزی بەهارە     گرانی و قاتی چینی هەژارە

١٦٢. خیلافی شەرعت دی لە ئەهلی حاڵ     تێی هەڵدە ئەگەر بشفرێت بە باڵ

«نامی»

١٦٣. خێزانباری، خەفەتبارییە. تا ئەتوانیت با خەفەتت کەمتر بێت.

١٦٤. خێزانی خۆت مەکە بە دوژمن، بە بێ عەدالەتی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ مەکە.

١٦٥. خەمی خۆت لە هەموو کەس زۆرتر بخۆ، «فەرزە لە سەرت».

***

# پیتی ‹ د ›

## پەندی پێشینان

١. داخت سەوزە لە دلّما تا ئاو مابێت لە زەلّما

«زەلّم، ناوی ناوچەییکە لە هەورامانی هۆنی عێراق، کە ئاوێکی زۆرو پاکی لێیە، وەك ئاوەکەی بلّ، لە هەجیج».

٢. داخی دلّ با بچێتە ژێر گلّ.

٣. داخی دلّ زۆرە، بەلاّم حەیف کە دلّ سفرە نیە کە لە بەردەم هەموو کەسێکا بیکەیتەوە.

٤. دار بە توولّی نەچەمێتۆ، بە گەورەیی کاری لیّ ناکرێت، منداڵیش ئەبیّ لە منداڵیەوە فێری ئیشو کارو زەحمەت کێشان بێت.

٥. دار بە کونە زەردەواڵەدا مەکە — کە کردیشت خۆت بۆ چزی حازر کە

٦. دار خورما بەرزە و دەسمان کۆتایە — دەی کیّ بەتەمای خواردن خورمایە

هەر دەردیسەری لەسەر منایە — تەمایەر شتی، مەحالّی تیایە

٧. دار لەسەر ڕیشەی خۆیۆ سەوز ئەبیّ — باوك و باپیری چۆنە وا ئەبیّ

٨. دار کە خۆی لار بوو، سێبەری لارە — ئەمە مۆجگاری ژیرو هۆشیارە

٩. دار بیّ سەمەر بۆ بڕین باشە.

١٠. دار پوازی لە خۆی نەبێت، ناقلّیشێت. «قەوم و کەسیش هەر وایە. یان: دار کرمی لە خۆی نەبێت سەد سالّ هەلّ ئەکات».

١١. دار پیر ئەبێت، جارێك باز بەسەریەوە ئەنیشێتەوە.

١٢. دارو پردوو، تف لە هەردوو.

١٣. دارو دیوارم لیّ هاتووەتە جواب. «واتە: هەموو کەس مەنعم ئەکەن».

١٤. دارەکەی سەرکەلّ پردەکەی گاڕان. «واتە: زۆر لە یەك دوورن». شیعرێکی فۆلکلۆر هەیە بۆ گالّتەو شۆخییەو هیچکام لەوانە وا لە ناو شیعرەکەدا هەن پەیوەندیان

بە یەکەوە نیە، ئەڵێ:

دارەکەی سەرکەل، پردەکەی گاڕان! ماسی لە سوورێن وەك کەر ئەی قاڕان!

«سوورێن کێوێکی بەرزو خۆشە لە ناوچەی مەریوان لە نزیکی دێی سیاناوو ئەسکۆڵ لە سنووری عێراق و ئێران».

١٥. دار هەڵگرە، سەگ دز دیارە.

١٦. داری بێ سەمەر، بەردی بۆ ناخەن.

١٧. داری شەهین نێرگەی لێ هەڵناکەوێ.

١٨. دارێك سەمەری زۆر بێ، سەری شۆڕە، بۆیە دەوڵەمەندیش هەر وایە.

١٩. دارێك کە لە سێبەریا دائەنیشیت مەیبڕە.

٢١. دارێ نەرم بێ، کرم و مار ئەیخوات. «واتە: لەجێگای خۆیا نەبێ، نەرم مەبە».

٢٢. دانوولە بە چی زیاد ئەکا. بە خواردن و شێواندن.

٢٠. داری مایە دار، ژنی حەیادار باش و بەکەڵکن بۆ پیاوی هەژار

٢١. دانیشتن بە لای مەرگ و میراتۆ عیلم و هونەرت لە بیر ئەباتۆ

٢٢. داوا کردن مەرگ لە خودای گەورە باش نیە، مەگەر بڵێی بەم جۆرە

هەتا ژیانم باشە، با بژیم لەگەڵ نەمانم باش بوو با نەژیم

٢٣. دانە خۆرەی کە با بێتە سەری دەسگیری ئەکەی بێ دەردیسەری

«واتە: چەشتەی بۆ دانێ و بیگرە»

٢٤. دایك ڕۆ ڕۆت بۆ نەکات. «بە کەسی ئازاو زیرەك و نەترس ئەڵێن».

٢٥. دایکی دز، بڕێ وەخت سین ئەخوات و بڕێ وەختیش سین ئەکوتێت.

٢٦. دایکی کراس کەوە نەمردووە، هەر ژن زۆرە.

٢٧. دای لە بن کوولەکە. «واتە: هیچی لە دڵیا نەهێشتووە و هەمووی هەڵڕشت».

٢٨. دایە لەوساوە تۆ مۆجگاری من ئەکەی، من سیوسێ مێشم بە گون کەرە دێزەوە ژماردووە. «منالی بێ گوێ وا ئەڵێ».

٢٩. ددانی شاشە، عەقڵی باشە ددانی پڕە عەقڵی شڕە

«تەجروبەیە»

٣٠. درۆ بناوانی نزیکە، گەر بچی بە شوێنیا زوو ئەیدۆزیتۆ.

٣١. درۆزن جارجار ڕاس دێ بە دەمیا     گەر بە ڕاسی بێ یا خۆ بۆ ڕیا

٣٢. درۆزن ڕووڕەش دەرگای خودایە     لەلای هەموو کەس پەست و ڕیسوایە

٣٣. درۆزن کەم هۆشە.

٣٤. درۆ نە فەرزە و نە سوننەت، بەڵکو گوناحێ گەورەیە.

مەیکە بە پیشەی هەمیشە بۆ خۆت     لای خەڵکا مەیبە ئیعتیباری خۆت

٣٥. درۆ وەکوو هەرەس وایە تا تلاوتلێی پێ بکەی گەورەتر ئەبێ.

٣٦. درەوان وتوویە: مشکێکم کۆمەك بێت پێم خۆشە. «درەوان: کەسێك کە درەو ئەکات»

٣٧. درێژ دڕ مەبە، مەیکە بە پەلە پەل، «خیرالکلام ما قلّ و دلّ».

«واتە: با وتەت کورت و کۆتا بێ     بەو شەرتە پوختەی مەرامی تیا بێ»

٣٨. دز ئازا بوو ساحێب ماڵی گرت.

٣٩. دز ئازا بێت، تاریکە شەو زۆرە.

٤٠. دز ئەبێ دەستی ببڕیت. «ئەگەر ئەم حوکمە شەرعیە ڕچاو بکرایەت، دەسدار زۆر کەم ئەبوو».

٤١. دزاودز کەوتووە، بۆیە پەیدا نابێت.

٤٢. دز بەبێ دزدەسەك دزی بۆ ناکرێت.

٤٣. دز بەو بە ئینساف بە.

٤٤. دز دەستی خێر بێ باشە.

٤٥. دز، کە بازاڕی شێواوی ئەوێ     بە فێڵ شتێکی بەشکو دەس کەوێ

٤٦. دز لە پیریدا تۆبە بکات، قازانجی نە بۆ خۆیە، نە بۆ خەڵك و وڵات.

٤٧. دز لە دیاری کراویش ئەدزێت.

٤٨. دز وەختێ تۆبە بکا     کە ناتوانێ دزی کا

ئەبێ خۆی و خەڵکیتر     چ قازانجێکی تیا کا

لە جووانیدا تۆبە کات     ئەگەر ڕاستە و ڕاست ئەکا

لە ڕیسوایی دوو دنـیا　　　　خۆی و خەڵك ڕزگار ئەکا

٤٩. دز وەکو گورگ وایە، تا ڕۆژێك تێر بێ دە ڕۆژ برسیەتی.

٥٠. دزی کەسی دەوڵەمەند نەکردووە.

٥١. دزێ کە قیمەتی چوارو یەك دیناریێ بدزێ، شەرعەن ئەبێ لـە موچیا دەسـی ڕاسـتی ببڕن. «چوار ٥٢. یەك دیناریێ: چوار یەك لیرەیەکە. ئەگەر ئـەم حوکمـە جـاری بکـرێ دەس‌دار کەم ئەبێ».

٥٣. دزی ناشی کایەن ئەبڕێت. «کایەن: جێی کاو ئالف، کاهدان»

٥٤. دزی نێو ماڵ ناگیرێت.

٥٥. دز یەکێکە و شك هەزار.

٥٦. دڵ ئاوێنەی دڵە، دڵ وەك پەڕەی گولە　　　　دڵم زۆر بە کوڵە، بۆ ئەو تاقە گولە

٥٧. دڵ خـەڵـوەتخانەی زیکری یەزدانـە　　　　کەی جێی وەسوەسە و خەیاڵ شەیتانە

٥٨. دڵت مەکە بە هەمارو خەمی زۆری تێ مەکە

خەریك دینداری خۆت بەو چاولێ‌گەری‌کەس مەکە

٥٩. دڵ گۆشتە، کە ئێشا، دێر ئاشتی ئەبێتۆ.

٦٠. دڵـمـان خـۆشـە بـووکی بەگـیـن　　　　سەرو پا پەتی و جەسـەی سەگـیـن

٦١.　　　　دڵم خۆشە بەچکە خانـم　　　　بۆ نانێ دەرنەچێ گیانـم

٦٢. دڵم نیە بە ماڵۆ، شەیتان ئەمباتە خەیاڵۆ.

٦٣. دڵم وەك سەعات لێ ئەدات، ئەوەندە چاوەڕێتانم.

٦٤. دڵ وەکو پەڕەی گوڵ وایە، مەیڕەنجێنە.

٦٥. دڵ هـەر دڵێکـە، مەیـدە بـە هـەزار　　　　بـە ئـەنواعی دەرد مەیکـە گرفتـار

دڵە هـۆشت بۆ، هۆش و گۆشت بۆ　　　　تەقەی پاچ و بێڵ هەر جە گۆشت بۆ

وەختـەن کـفنـەکەم، بـاڵا پـۆشت بـۆ

دین لـەم ڕۆژگارەدا وەسیلەیە بۆ نان پەیدا کردن. هەر دەمییە، دڵی نیە.

٦٦. دڵی دایك و باوك وەك پەڕەی گولە　　　　کاڵۆ کـردنـی زۆر زۆر مـوشکـڵـە

ئۆف کردن بە دەست دایكو بابەوە　　　　لە قـاپی یـەزدان دوورت ئەخاتـەوە

یەکێکیان کز بوو یان خۆ هەردووکیان — خزمەتیان بکە بە دڵ و بە گیان
عورزەت بێ بەسەر ماڵ و منالّتا — ئەوانیش وەك تۆ خزمەتیان ئەکا
پاش مردن دوعای خێریان بۆ بکە — هاتوچۆی قەوم و ئاشنایان بکە
بڵێ پەروەردەی دەستی ئەوانم — داوا کار ڕەحمی خوا بۆ ئەوانم

٦٧. دڵی موسوڵمان عەرشی خودایە — ئەمە فەرموودەی ڕەسوولی خوایە

«قَلبُ المُؤمِنِ، عَرشُ الرَّحمنِ»

٦٨. دنیا دوو ڕۆژە، ڕۆژی خۆشی هۆشت لە خۆت بێ، گوناحی تیا مەکە. ڕۆژی ناخۆشی سەبر بکە با جەزات زۆر بێ.

٦٩. دنیا هەروا ڕۆشن نابێ، ئەبێ هۆشمان بەلای تاریکی قەبرو قیامەتانۆ بێ.

٧٠. دنیا هەموو تەواو ئەبێ، ئەوەی کە ئەمێنێتەوە چاکە و خراپەیەکە کە ئەیکەین.

٧١. دنیا هیچ نیە، دنیا فانییە — دنیا بۆ هیچکەس هیچ وەفای نیە
خۆت ماندو مەکە بۆ ئەو فانییە — ئەعمال ساڵحە خێرو باقییە
خەریك تاعەت بە، هەتا هێزت هەس — دنیا قەباڵە نەکراوە بۆ کەس
«دنیا زیندانە لەبۆ موسوڵمان — بەهەشتە لەبۆ بێ دین و ئیمان»

«نامی، هۆنراوەی دوایی»

٧٢. دوای چل ساڵ گەدایی، هێشتا نازانێ شەو جومعە کەیە.

٧٣. دوای ڕووتۆ کردن، تەشتی تەلاّ بێ بە سەرۆ.

٧٤. دوای مردن هەر ڕەحمەت کردن باشە تا غەیبەتی مردوو.

٧٥. دۆ بە بە بێ دۆ، وا ئەزانێ ماسە — کەوچکی تێ ئەخاو ئەڵێ زۆر خاسە

٧٦. دۆخەوام لێ ناو مای هاتۆ — یارۆ تۆراو خۆی هاتۆ

٧٧. دوژمن تۆ کەسێکە ڕێگای شەڕت نیشان ئەداو دۆست ڕێگای خێر ئەنێتە بەرت.

٧٨. دوژمن، سەرچڵی داری حەوشەکەی بشکێنیتەوە، هەر باشە.

٧٩. دوژمنی زانا لە دۆسی نەزان باشترە، زانا حورمەتت ناشکێنێ.

باشی داناوە شاعیری زانا — لەبۆ مۆجگاری نەزان و زانا

٨٠. دوژمن ئەبێت بە سەبەب خێر، ئەگەر خودا بیەوێت.

٨١. دۆستم ئەوەیە ئەم گریێنێت، دوژمنیشم ئەو کەسەیە ئەم کەنێنێت. «یا: دۆست ئەو

کەسەیە بتگرییێنێت، دوژمن ئەوەیە بتلاونێت».

٨٢. دۆستی ئەکەی با تا سەر بێ — با گرانە و باسی لە سەر بێ

٨٣. دۆس ڕاستەقینە وەسە کەس و کار — هەوڵ دەدەن لەبۆ چارەی گرفتار

٨٤. دۆسی سەر سفرە، هەر ئەو تاوەسە — خەریك خواردن و هەواو هەوەسە
هەتا پێت ئەکرێت دوور بە لەو دۆسە — بڕوات پێ نەبێت دۆسی وا کۆسە

٨٥. دۆسی وەفادار لە هەزار قەوم و کەسی ناکەس باشترە کە لە ڕۆژی تەنگانەدا بە کار دێن.

٨٦. دۆعا کردن بۆ تەمەن درێژی زاڵم، گوناحێکی گەورەیە. «چونکا دۆعایە بۆ دەوامی زوڵمەکەی، یان ئەگەر دۆعای بۆ ئەکەی دۆعای چاك بوون و ئیسلامی بۆ بکە. خوا لێ خۆش بوو شێخی سەعدی نیوەڕۆیەك بە لای زاڵمێکدا تێ ئەپەڕێ کە خەوی لێ کەوتبوو، فەرمووی ئەم فیتنەیە هەر لە خەوا بێ باشترە، پاشان فەرمووی: کەسێك خەوتنی لە خەبەری باشتر بێت، مردنی باشە».

٨٧. دۆعا مەکە لە نەویستان، با نەگەڕێتۆ بۆ خۆشەویستان.

٨٨. دوکتۆر ئەبێ حازق بێ، ئەگەر حازق نەبێ بە گەوڕ گاکانیش نامەحرەمە.

٨٩. دۆڵەی پڕ، ئاشتیماڵە.

٩٠. دونیا بۆ کەسێ خۆشە، ڕەزا بە قەزا بێ.

٩١. دونیا بە جنۆکە پێ‌ئەکەنێ و جنۆکەش بە ئاشەوان.

٩٢. دونیا بە وێنەی ساجی ڕووکەشە — هەر کات و ساتێك بۆ کەسێ خۆشە

٩٣. دونیا بێوەفایی بۆ کەس نەبووە کەم — خۆم بە خەفەت تۆ دەردەدار ناکەم
تەلاقت ئەدەم پەیڕەویت ناکەم — ئیتر لە خەم تۆ خۆم ڕزگار ئەکەم
لەم دونیا هەرکەس کە ساحێب بەشە — گوێ ڕایەڵ دونیا نابێ و ڕوو گەشە

٩٤. دونیا بێ بە سووزن فرۆش، خوا پەکیان ناخات.

٩٥. دنیا جێگای کشت و کاڵی قیامەتە، خەرمانەکەیش هەر لە قیامەتدا هەڵئەگیرێت.

٩٦. دنیا جێگای هەموو کەسێکی تیا ئەبێتەوە، خاس و خراپ.

٩٧. دنیا چوار دەستە بەشەری تیا ئەژی:

یەکەم: پیاوی لە خوا ترسە کە عیلم و زانیاری و ماڵی زۆری هەیە و بە عیلم و ماڵی خەریکی

خزمەتە بە خوداو خەڵکی خودا. دیارە ئەم کەسە دەرەجەی یەکەمی هەیە لە لای خودا.
دووهەم: ەو کەسەیە کە عیلمی زۆری هەیە، بەڵام ماڵ و دارایی نیە، ئەم کەسەش بە زانینی خۆی خزمەتی خەڵك و دین ئەکات و ئاوات ئەخوازێت کە سەروەتی ببوایە تا وەکو کەسی یەکەم لە خزمەت خوداو خەڵکی خوادا خەرجی بکردایێ. ئەمەش دەرەجەی یەکەمی هەیە لای خوا.
سێهەم: کەسێکە کە ماڵی دونیای زۆرە و عیلم و زانیاریشی نیە و ماڵ و سەروەتەکەشی لە رێگای خراپ و هەوەس بازییا خەرج ئەکات و ناکەوێت بە دڵی شەیتانیەوە، ئەم کەسە خراپترین دەرەجەی هەیە لە خزمەت خوادا.
چوارەم: کەسێکە کە نە ماڵی هەیە و نە عیلم و زانیاری، ئاواتە خوازە ماڵی بوایە و وەکوو کەسی سێهەم خەرجی بکردایێ و خەریکی ڕابواردن بوایە، ئەمەش وەکوو کەسی سێهەمە. «لە حەدیسەوە وەرگیراوە»

٩٨. دنیا چەن جوان و پان و بەرینە — بە ئەنوای نیعمەت دایم ڕەنگینە
شەیتان بۆ بێ دین وا تەنگی ئەکات — بۆیە بازێ کەس خۆکوژی ئەکات

٩٩. دنیا دوو ڕۆژە، ڕۆژێك قازانج و نیعمەتی تیایە ئەبێ شوکری بکەی و ڕۆژێك زەرەرو زەحمەتی تیایە ئەبێ سەبر بکەی.

١٠٠. دنیا دەوران دەورانە — هەر ڕۆژێ نۆرەی یەکێکمانە

١٠١. دنیا زیندانی چاکانە و بەهەشتی نەزان و نەفامەکانە.

١٠٢. دنیا، کڵاو چەرخانێکە، تا لا ئەکەیتۆ ئەڕوات.

١٠٣. دنیا کە عیبارەت لە هەواو هەوەسێکە — وەك تاسی حمام هەر نەفەسێ بۆ تەرەسێکە

«شێخ ڕەزا»

١٠٤. دنیا لاکە تۆپیوە و موشتەری لاکیش سەگە.

١٠٥. دنیا نموونەی قیامەتە.

١٠٦. دنیا نەمەنە پەی پێغەمبەرا — گردما کۆچ کەرمێ ئەی بێ خەبەرا

١٠٧. دنیا لەگەڵتا ئەگەر نەسازە — تۆ لەگەڵ ئەوا ژیر بەو بسازە

١٠٨. دنیا هەتا سەر، بۆ هیچکەس نابێ — خۆزگەم بەو کەسە، گیرۆدەی نابێ

١٠٩. دنیای بێ بونیا، کاروانسەرا ڕەنگ      نیمێ بە دڵشاد، نیمێ بە دڵ تەنگ
کاتێوەت زانا خول ئاوەردەوە      ئێمەیچ چوون یاران پێچما کەردەوە
«مەولەوی»

١١٠. دنیاو قیامەت وەکوو هەوێ وانە، تا یەکێکیان نەڕەنجێنی ئەویانت بۆ دڵخۆش نابێت.

١١١. دنیا وەکوو سەرچۆپی وایە، هەرساتێ وا بەدەس کەسێکەوە.

١١٢. دونیایەك کە مردنی لە شوێن بێت، ئەم هەموو خەمەی ناوێت.

١١٣. دووپشك، دووپشك دەرئەهێنی. «هاوجنس بە هاوجنس ئەوێرێ».

١١٤. دوور بڕۆو دروست بێڕۆ.

١١٥. دوورو دۆس.

١١٦. دنیا دەسەوامە.

١١٧. دۆست تەماشای کڵاوت ئەکات      دوژمن تەماشای پڵاوت ئەکات

١١٨. دوو شت ناسکی عەقڵی ئینسانە      ئینسان کە جێگەی سەهوو نیسیانە
وتن بێ جێگاو نەوتن بە جێ      بە وتن کارمان ئەبێ جێ بە جێ

١١٩. دوو شت لە دوو شوێنا ئارامیان نیە و ئۆقرە ناگرن، یەکەم: ئاو لە ناو بێژنگدا دووهەم: عەشق لە دڵی عاشقاندا.

١٢٠. دوو شت زۆر عەجایەبە دڵیان پێ سارد ئەبێتۆ: جووانێ کە خۆی پیر بکات، پیرێ کە خۆی جوان کاتەوە.

١٢١. دوو قوتبی دەوری دنیا هەر یەکێ شەش مانگی شەوە، بەختی من وا شێواوە، دوانزە مانگم هەر شەوە.

١٢٢. دوو کەس لە دونیا تووشی پەشیمانی ئەبن، یەکەم: ئەو کەسەیە کە هەیەتی و نایخوات، دووهەم: ئەو کەسەیە کە ئەزانێت و نایکات.

١٢٣. دوو کەس ئەبێ خۆزگەیان پێ بخوازیت. یەکەم: ئەو کەسەیە کە دەوڵەمەندی خاوەن ئیمانە و حەقی خواو خەڵکی خوای بەسەر خۆیەوە نەهێشتێ. دووهەم: عالمی خاوەن عەمەڵ و لە خوا ترسە کە هەمیشە خەریکی دەرس وتنەوە و ڕاگەیاندنی

عیلمەکەیە بە خەڵك.

١٢٤. دووکەڵ لە سەری بەرزۆ ئەبێتۆ. «ئەونە جگەرەی کێشاوە ڕەنگ بە ڕوویۆ نەماوە».

١٢٥. دوو گا لە دۆڵێکا بن ڕەنگ یەك نەگرن، خووی یەك ئەگرن.

١٢٦. دووگ بە دەستی پشیلە مەسپێرە، جێگای متمانە نیە.

١٢٧. دووگوێ و زوبانێکی خوا داوە بە تۆ — دوو بیسە و یەکێ بلێ لەسەر خۆ
زوان یەکێکە و گوێچکە دووانە — یانێ یەك بێژەو دووان بزانە

١٢٨. دوو مرەکی وەها لێ وێساوەتۆ — قەهرو غەزەبی تەواو هاتە سۆ

١٢٩. دوو نەفەر گەیشتن بە یەکتر، یەکێك بەوی تری وت: ناوت چیە؟ وتی: زیائەدین. وتی: بێ ڕاستەو ڕاست دەربێ، زیادەی خۆت بۆ خۆت.

١٣٠. دەی با هی تۆ بێ میسرو ڕۆم و چین — لە ژێر پێتا بێ تەواو سەرزەمین
بەشی من و تۆ وەك یەکە کاکە — دوو میتر کفن و دوو میتر خاکە

١٣١. دەردەدار زانۆ حاڵی دەرد چێشا — بێ دەرد خەریکو ئاهەنگ و وێشا

١٣٢. دەردی بێ دەرمان عەشق و مردنە — بۆ چاری هەردوو پارێز کردنە

١٣٣. دەردی بێ دەرمان مەرگ و پیرییە — عاقیبەت هەردوو زەمینگیرییە

١٣٤. دەردێکم گرتووە باشقەی دەردانە — لوقمانی حەکیم بۆی سەرگەردانە

١٣٥. دەردی نەفامی دەرمانی نیە — لە کەس مەپرسە دەرمانی چیە

«واتە: هەر دەس ناکەوێت»

١٣٦. دەربڕینی خەفەتباری، خەفەتی پێ سووك ئەبێ.

١٣٧. دەردەدار لە حاڵی دەردەدار ئەزانێت.

١٣٨. دەردە داری لە قەرزاری باشترە.

١٣٩. دەردەکەت بۆ دەرمان ناکرێت، مەیکولێنەرۆ.

١٤٠. دەرزی داخەی ناکەوێتە زەوی. «ئەونە جەنجاڵە»

١٤١. دەرس زایە مەکە، مەیلێ بە نەفام — شاگردی وریا وەربگرە تەمام

١٤٢. دەرس وتنەوە، دەرکردنی زەکاتی عیلمە. شاگردێ وریا بێ موستەحەقترە.

١٤٣. دەرگا زێڕینە موحتاجی دەرگا هەڕینە ئەبێ.

١٤٤. دەروازەت بۆ ئەبەسرێ، دەم خەڵکت بۆ نابەسرێ.

١٤٥. دەروێش بە، دڵڕیش مەبە، حەسوود مەبە.

١٤٦. دەروێش و سۆفی هەردوو یەکێکن هەریەك ئیستیلاح مەملەکەتێکن
سۆفی عەرەبی ساف و بێگەردە دەروێش عەجەمی ساق و بێ دەردە

١٤٧. دەریا بە دەم سەگ، سپڵۆت نابێ.

١٤٨. دەس ئەکا بە خۆیا قسە دەربێنێ. «بوختان چیە»

١٤٩. دەس بات، بە پیری گەداییەوە ئەڕوات.

١٥٠. دەستدار بردی و بێ دەستیش تەماشای کرد.

١٥١. دەس کار ئەکات و چاو ئەترسێت.

١٥٢. دەست لە دەست و قووەت لە خوا با ئەم کارە بکەین بە یارمەتی خوا

١٥٣. دەست مەدە لە زام پەترۆ بەستەکەم با نەکولێتەوە ماران گەستەکەم
«فۆلکلۆری کوردی»

١٥٤. دەست مەدە لە تانەکەی، با پۆکەی دەرنەکەوێت.

١٥٥. دەست نەڕۆیشتن نیعمەتێکی گەورەیە، کە دەستت نەڕوا زوڵم لە کەس ناکەی.

١٥٦. دەست و دەمی بێ یەك، با دەنگ بەرزۆ نەکات.

١٥٧. دەستە چەورەکەی خۆت بەسەر منا مەساوە، بیساوە بە سەرو سمێڵەکەی خۆتا.

١٥٨. دەستەیەك گوڵ و دەستەیەك نێرگز مەرگتان نەبینم هەرگیزای هەرگیز

١٥٩. دەسێك خێرە و دەسێك شەڕە خۆت لادە لە هەڵە و وەڕە

١٦٠. دەس شکاو کاری لەدەس دێ دڵ شکاو کاری لەدەس نایێ

١٦١. دەستی ئەڵێی شایەنە، ئەوەندە میزانە.

١٦٢. دەستێك شەرع بیبرێت، خوێنی نیە.

١٦٣. دەسێکم هەنگوێن بێ و دەسێکم دۆشاو، هێشتا هەر خەڵك باشم ناڵێن. «ئەوەندە کەم بەختم».

١٦٤. دەستی ماندوو بێ سەر سکی تێر. «واتە: کاریگەر بەو بێ منەت بژی».

١٦٥. دەسم ناگا سەر خۆم بخورێنم.

ئەونە زەحمەت و دەردی سەرم هەس — لە بیرم نیە دنیای ڕۆشن هەس

١٦٦. دەسمی کردووە بە ڕۆنی داخا — دەسی بڕیم وکردی بە زاخا

١٦٧. ذەمم بیلێیت، سەرم سەلامەتە.

١٦٨. دەسەڵات فرسەتە، تا بە دەستەوە ماوە دریغ مەکە.

١٦٩. دەسی بە دەمی خۆی ناگا. «واتە: فەقیرو بێ نەوایە».

١٧٠. دەفەکەی دەنگ نادا ئەگەرنا ئاوەها بێ دەنگ دانەئەنیشت.

١٧١. دەلاکەکان کە بێکار بن، سەری یەکتر ئەتاشن. «دەلاك: سەرتاشە»

١٧٢. دەلیلی عەقڵی لەسەر باشی زانین ئەوەیە کە نەزانیش ئیددیعای زانین ئەکا.

«ئیمامی غەزالی»

١٧٣. دەم سەگ بە تیکە بەسە — خۆت لادە لە وەسوەسە

١٧٤. دەمی دۆشاوە، دڵی زوخاوە.

١٧٥. دەمم نەبێ ها بکەم و پام نەبێ ڕا بکەم، ئەی لەم ناوە چ بکەم.

١٧٦. دەمم وتی: هانێ. سکم وتی: کوانێ. «واتە: ئەوەندە کەم بوو هیچم لێ حاڵی نەبوو».

١٧٧. دەمی بووە بە تەڵەی تەقیو، «هیچی پێ نەماوە بیلێ».

١٧٨. دەمێکە بۆ تۆ پاڵە و پاڵ ئەکەم — وەك دۆم سەی سایەقماڵە و ماڵ ئەکەم

«دۆم: بەو کەسە ئەڵێن کە کلاش دروست ئەکات».

١٧٩. دەنگم نەماوە، هەر هەناسەمە — بۆ دووری باڵات خەیلێ تاسەمە

١٨٠. دەنگ نەکەر تڕدەنگ کەری بڕیوە — کە بێدەنگ بەشی خۆی لێ چڕیوە

١٨١. دەنگی نەماوە لە ناو دلێران — ڕێوی ڕاو ئەکات لە جێگەی شێران

١٨٢. دەنگی دهۆڵ لە دوورەوە خۆشە.

١٨٣. دەوای دڵی موسڵمان، زیکرو ویردی خودایە

تەرکی عەلاقەی قەلبی، تەواوی ماسیوایە

١٨٤. دەوای دەردی دڵ زیکری خودایە — خۆزگەم بەو کەسە هەمیشە

١٨٥. دەوری بوو بە دەوری لۆکە — وایە خانم ئەبێ بە خانمە جنۆکە

«دەوری لۆکە: واتە دەوری چکۆلە، خانم جنۆکە: واتە خانمی بێ سەرپۆش (بێ حیجاب). ئەو کەسەی ئەم پەندەی گوتووە لەوانەیە ئەمڕۆی لەبەرچاوا بووبێت».

١٨٦. دیزەی ڕەش ئەشکێنم بە شوێنیا.

١٨٧. دەوری مەجنوون تەواوە، دەوری ئێمە هاتووە
هەرکەس چاکەی پێ نەکرا، خەساری لێ کەوتووە

١٨٨. دەوڵەت مەیلی بێ، بە گا کەروێشك ئەگرێ. «ئەگەر شتێ نەکا، مەیلی نیە بیکا».

١٨٩. دەوڵەمەند ترسنۆك و درۆزن و حیلە گەرە، بۆ پاسی سەروەتەکەی هەموو کارێك ئەکات.

١٩٠. دەوڵەمەندی لادێ کەسێکە کە لە بەهارا نانی بێ و لە پاییزا دۆ.

١٩١. دەوڵەمەند شەواو شەو پلاو ئەخوا، گەدا جەژناو جەژن.

١٩٢. دەوڵەمەنی و گەدایی هەرکەس وا لە ماڵی خۆیدا، ماڵی خەڵك بە من و تۆ چی.

١٩٣. دەوەن بە ئاشە. «بە کەسێ شەڕفرۆش بێ وا ئەڵێن».

١٩٤. دەینی کەس مەهێنە سەر خۆت، مەرگ لە کەمین دایە.

١٩٥. دیداری دۆس چ ساتێك و چساڵێك.

١٩٦. دیانی کرمۆڵ چاری کێشانە قەسەم بەو کەسەی شای دەروێشانە

١٩٧. دیزەکەر لۆمەی گۆزەکەر ئەکات.

١٩٨. دیزە بە دەرخۆنە بێ باشە. «واتە: بەرزی مەکەرۆ با ناوەکەی دەرنەکەوێت».

١٩٩. دیزە بەکۆڵێن، داوای ژن ئەکەین هەرچی کە بێژن بە گوێتان ئەکەین

٢٠٠. دینت ئەوێ شارستان، دونیاشت ئەوێ شارستان.

٢٠١. دین لە ئاخر زەمانا وەکو ئاگری لێ دێت، تووڕی ئەدەی ئەفەوتێت، ئەیشی گری دەست ئەسووتێنێت.

٢٠٢. دین لەم ڕۆژگارەدا وەسیلەیە بۆ نان پەیدا کردن. هەر دەمییە، دڵی نیە.

***

# پیتی <ر>

## پەندی پێشینان

١. ڕازو نیـازت دانـێ لای یـەك کـەس  بـەڵام پـرسیارت کە بە هەزار کەس

«یا: ڕازت لای کەسێ دانێ و پرست لای هەزار».

٢. ڕاستی ڕەحمەتی لێ ئەباری و ناڕاستیش زەحمەت.

٣. ڕاستی ڕەفتی، چەفتی کەفتی.

٤. ڕاسەکان ڕۆشتن و ڕاستیەکانیان لەگەڵ خۆیانا برد، ئێستا چـەوتەکان ماونـەتۆ، بۆیـە دونیا نامیزانە.

٥. ڕاسە کەرە و دۆڵە ماسە.

٦. ڕافیـعـە بـۆ دەرد، دافیـعـە بـۆ ئیش  دیـداری دۆس و سـیلەی قـەوم و

٧. ڕاوچی کەم ڕزقە، مەبـە بـە ڕاوچـی  خوێش با لە ژێر باری ماڵت دەرنەچی

٨. ڕاو کردن کەم کەم مـایەی شـادییە  ڕاو کـردن دایـم، نـامـورادییە

«نامی»

هەر ڕاوێ ئەکەی، چاوە ڕاو مەکە  خۆت تووشی بەڵاو دەردو داو مەکە

٩. ڕاوە ڕێوی مەهێنەرۆ. «بە کەسێك ئەڵێن کە گەرەکی بێت باسێك بگۆڕێت».

١٠. ڕزق وەسە سێبەر، وا بەشوێن بەشەرۆ.

١١. ڕزقی سوارە و خۆی پیادە، هەر پێ ناگا.

١٢. ڕزقی میوان بەر لـە خۆی ئەگاتە بەرۆ.

١٣. ڕۆژان ڕۆژیان لـە شوێنە، بیری دوا ڕۆژت پێوە بێ.

١٤. ڕۆژ بــە قـامـك ئەژمێـرم  خـۆم لـە ژێر بار دەربێرم

١٥. ڕۆژ بە هەنگووس ئەژمێرم  خـۆم لـەم خەمە دەربێرم

١٦. ڕۆژ دیارە، نایەوێ قامکی بۆ ڕاکێشی. «قامك: پەنجە»

١٧. ڕۆژگار بۆو بە ساڵ، سك بوو بە جەواڵ. «لە ڕۆژگار درێژیدا وا ئەڵێن».

١٨. ڕۆژووی ڕەمەزان دەوایە بۆ نەخۆشی لەش و سەربەرزییە بۆ حوزووری خوا.

ناتوانێ نانێ بۆ خۆی پەیا کا ‌ ‌ ‌ بۆ لای کاسبی بۆ کام لا ڕاکا

١٩. ڕۆژی ڕۆشن بۆ تەمبەڵ شەوە زەنگە.

٢٠. ڕۆژێ نەجارێ ناسك کار بە تەشوێیێ تیژ، دارێکی لەسەر بەردێك ئەتاشی، ڕێ نەکەوت کە ڕایەك تەشوێکە بدا لە بەردەکە. پاشاو وەزیر بەلایدا ڕۆیشتن، پاشا وتی: زۆر عەجایبە کە تەشوێکە ڕایەك لە بەردەکە نادا، وەزیر وتی: دڵ مالۆی خۆشە. پاشا وتی: دەی تۆ تەجروبەی کە. وەزیر تەکی دا بەلای ژن نەجارەکەوە و لە گەڵیا ڕۆیشتن بۆ لای نەجارەکە. ئەمجارە تا ڕایەك تەشوێکەی ئەدا لە دارەکە دوو جار ئەیدا لە بەردەکە. وەزیر وتی: پاشا نەموت دڵ مالۆی خۆشە، بۆیە وتراوە:

ئەگەر ڕووی خۆشە ئاغەی بێ ڕیشم ‌ ‌ ‌ ڕێك و پێك ئەبێ کول کارو ئیشم

ئەگەر خوا نەکا ڕوخساری تاڵە ‌ ‌ ‌ خوا نەیدا بە کەس ئەو ناڵە ناڵە

٢١. ڕۆژی نەفسی نەفسییە ‌ ‌ ‌ کەس ئاگای لە کەس نیە

٢٢. ڕۆن خۆم ئەدا لە سەرو قژ خۆم.

٢٣. ڕۆڵە باسی کەرە شین کەن. «پیاوێ سێ کوڕی بوو کەیبانویان نەبوو، تەنیا کەرێکیان بوو، دوای مەشوەرەتێکی زۆر، ڕای گشتیان هاتە سەر ئەوە کە کەرەکە بفرۆشن و بیدەن بە ژن بۆ باوکیان، باوکیان کە پێ خۆش بوو، هەموو ڕۆژێ ئەیوت: ڕۆڵە لاییەن باسی کەرە شین بکەن».

٢٤. ڕۆڵە لەبەر دەس دایکا هەڵ ئەگرێ. «ئەوەندە دزەو ئازایە».

٢٥. ڕۆن کە زۆر بوو، قون کەری پێ چەور ئەکەن.

٢٦. ڕۆن لە پیاو بسێنە و گەنم لە ژن.

٢٧. ڕۆن لەسەر پشتیا بماڵەرۆ، ئەوەندە ئەمینە.

٢٨. ڕۆنی ڕژاو ئەکا بە خێر بۆ باوك و دایکی.

٢٩. ڕووت لە قیبلە وەرمەگێڕە. «واتە: لە قەوم و قەبیلەت دوور مەکەوەرۆ».

٣٠. ڕوو زەردی کێشان مایەی بێ دەسەڵاتییە.

٣١. ڕووی تەگبیر کەرەکەت ڕەش بێ.

٣٢. ڕووی خۆت ڕەش مەکە — قەولی درۆ بە کەس مەدە

٣٣. ڕووی زەمانە ڕەش بێ — با ئێمە ڕوومان گەش بێ

٣٤. ڕۆیشت چاوی برێژێ، خۆی کوێر کرد.

٣٥. ڕەحم بە پلنگی دیان تیژ و پیر — زوڵمە لە مەڕی هەژارو فەقیر

٣٦. ڕەحم کردن بە زۆردار — زوڵمە لە چینی هەژار

٣٧. ڕەحەت خۆرێکی قەراخ نشینە — نە کاریگەرە، نە دەس نەخشینە

٣٨. ڕەنج، پاداشی گەنجە.

٣٩. ڕەحمەت لەو کەسە دوو موسوڵمان ڕێک ئەخا یا بۆ ژن و ژن خوازی، یا بۆ شەریکە کاسبی، یا بۆ هەر کارێ کە خێر بێ.

٤٠. ڕەحمەتی خوا ئەبارێ، وەختێ ناو چاکان ئەبەین

دەیسا هەروا هەمیشە ناویان بە چاکی ببەین

٤١. ڕەحەتی دەس ناکەوێ، لە دوای مانوو بوون نەبێ. «نیعمەت لە ئاسمانۆ داناکەوێ، بەڵکوو نیعمەت سەمەرەی مانوو بوون و زەحمەت کێشانە».

٤٢. ڕەزایەت خوا وا لە ژێر، ڕەزایەت باوك و دایکا. «حەدیسە»

٤٣. ڕەزایەت خوا، وا لەگەڵ ڕەزایەت خەڵکا. «حەدیسە»

٤٤. ڕەش بێ و بۆر بێ، هەر کۆڵ زۆر بێ. «ئەوانە ئەچن بۆ کۆڵە گیا وا ئەڵێن».

٤٥. ڕەشە ڕێحانە خۆمی پێ ڕەش کەم — لە دوای باڵاکەت دڵ بە کێ خۆش کەم

«فۆلکلۆری کوردی»

٤٦. ڕەفێقان لوان هەر من مەنەنا — مەزانوو منیش تاکەی بەنەنا

٤٧. ڕەفێقانم هەموو ڕۆیین لە ڕێدا — بە تەنیا هەر ئەمن ماوم لە جێدا

منیش هەروا ئەڕۆم کۆچم نزیکە — بنەو بارگەم بەرەو گۆڕێ خەریکە

٤٨. ڕەگ بە ڕیشەیە و گلێنە بە بنە توو — ئیسە هەروایە، زووتر هەر وابوو

«هەر شتێ لەسەر ڕەسەن خۆی ئەڕوات».

٤٩. ڕەنجبەر دەرگاکەشی پێ پێوە دەی، نابێ بێڵی بویسێ.

٥٠. ڕەنجبەری ماڵی خۆت بە و خۆشەویستی هاوماڵەکانت.

٥١. ڕەنجەڕۆ خۆم، چیم کرد بە خۆم — کێم کرد بە هاوڕێ لە بۆ خۆم

٥٢. ڕەنگ زەردی خەزان خەتای پاییزەن — ڕەنگ زەردییەکەی من دووری ئازیزەن

٥٣. ڕەنگم لە ڕوو نەماوە — ئەونە سزام کێشاوە

٥٤. ڕەنجی فەرهاد بکێشی، گەنجی قاروونت دەس ئەکەوێ.

٥٥. ڕیا شیرکی ئەسغەرە. «اصغر: وشەیەکی عەرەبییە بە مانا بچووك. واتە: کافری گەورە و بچووکی هەیە، چکۆلەکەی ڕیایە و لە هەموو خراپتر ئەوەیە کە زۆرتر ڕیا وا لە ناو ئەهلی دین و خوێنەوارا».

٥٦. ڕیا کار ڕوو ڕەش دەرگای خوایە — ڕیا کار ڕیسوای هەردوو دونیایە
خوا نەکا ئەگەر تۆ تووشی بووبی — تەرکی کە هەتا ڕیسوا نەبوویی

٥٧. ڕێبوارێ ڕووی کردە دێیەك، پرسی لە کابرایەك: ئەهلی ئەم دێیە چۆنن؟ وتی: ئەهلی ئەم دێیە گشتی دزو حیزو خراپن. لە دوای ئەوە بە یەکێ تر گەیشت و وتی: ئەهلی ئەم دێیە چونن؟ وتی: ئەهلی ئەم دێیە گشتی چاك و بە ئیمان و نوێژکەرن، بە یەکیتر گەیشت، وتی: چاکیان هەیەو خراپیشیان هەیە. وتی: لە دوو نەفەرم پرسی ئەوان هەریەکێ بە جۆرێ جوابیان دامەوە، وتی: ئەویانە کە وتی هەموویان خراپن، خۆی خراوە و هەموو کەس بە خراپ ئەزانێ، ئەویتریان خاسە بۆیە هەموو کەس وەك خۆی بە خاس ئەزانێ، من خاس و خراوی خۆشم و خەڵکیشم دیوە، بۆیە حەقیقەت بەیان ئەکەم.

٥٨. ڕێزەوڵ ناو سفرەکەم بە شام و نەهارماڵ خەڵکی نادەم.

٥٩. ڕێسەکەت مەکەرۆ بە خوری. «ئیشارە بە ئایەتە، واتە: وەك ئەو پیرە ژنە وا مەبە کە هەموو ڕۆژێ تا ئێوارە تەشی ئەڕست و ئێوارە ئەیکردۆ بە خوری و هیچ کاتێك گوڵوڵەیەك بەنی لە ماڵا نەبوو. تۆش ئەگەر چاکی ئەکەی، بە خراپکاری و ڕیا مەیکەو باشی بکە».

٦٠. ڕیش بوو بە ڕیشۆ، ئەبێ شانەی بۆ هەڵگری.

٦١. ڕیشێ بۆ ڕیاس، لایبە، بی بڕە — گووی خۆت و باوك و دایکتی پێ سڕە

٦٢. ڕیشێ چەنی من نەیۆ وە حوزوور — مشیۆ بتاشوش تا بە نەفخی سوور
«مەولەوی»

٦٣. ڕیشم لەبەر خۆرۆ، سپی نەکردووە، تەجروبەم هەیە.

٦٤. ڕیشـیّ بـۆ پیـاو درۆو تـەزویـرە
شـەخسی موسوڵمان زۆر پێی زویـرە
خـوا پـەنـامان با لەو نەوعە ڕیشـە
ڕیشـەی ڕیامان دەربـیّ لـە ڕیشـە
لاییـە بێتـاشـە بـا دەربیّ لە بێـخ
دەس خەرە نەبن، بەگ و مەلاو شێـخ

٦٥. ڕێك و ڕاس بلێیّ ماس
خۆتی بۆ مەکە مەلاس

٦٦. ڕیگەیان نەئەدا بۆ ناو ئاوایی، هەواڵی ماڵی کوێخای ئەپرسی.

٦٧. ڕێوی تا قەباڵەی خۆی خوێند، پێسیان کەند.

٦٨. ڕێوی تۆ ئاخر لە سەیری هوردوت چی؟
ئەگەر حەز ناکەی بە سەرۆ تیا چـی

٦٩. ڕێوی زۆر مەشهوورە بە فێلاّوی و بەسەرهات و داسـتانی زۆرە و مـن لێـرەدا بـۆ خۆشی سێ بەسەرهاتی ئەنووسم:

(١ – ڕۆژێ لـە زستانێکی سەختا کە زەوی بەفری زۆر داپۆشی بوو، بەفرە بەسـەر بوو دوو نەفەر کێلوویی کە لـە پێنجوێنەوە ئەچوونۆ بۆ کێلـوو، یـەکیان دوو کیلـۆ گۆشتی پیّ بوو. لـە ڕێدا تووشی لاکـە ڕێوییـەك بـوون کـە وەکـو دار خـۆی ڕەق کردبوو. لەو کاتا پێستی ڕێوی پارەی زۆری ئەکرد. ئەویانە کە دەستی خاڵی بـوو، ڕێوییەکەی نا بە شانێو بیباتۆ بۆ ماڵەوە و پێسی بکەنیّ. دوای ماوەیەك کە ڕۆیشـتن، ڕێوییەکە دەستێکی دا لـە دوای ئەوەی کە هـەڵیگرتبـوو، ئـەویش تـوورە بـوو لـە ڕەفێقەکەی و وتی: وا مەکە. ڕەفێقەکەی وتی: هیچم نەکردووە. بەینیّ تر چـوون و دووبارە دەسیّ تری برد بۆ دوای، دووبـارە وتـی: وا مەکـە. ڕەفێقەکـەی سـوێندی خواردو وتی من هیچم نەکردووە. دوای ماوەیەك تر کە ڕۆیشتن بـۆ جـاری سـێهەم ڕێوییەکە دەسێکی تری دا لـە دوای کابراکە، لـە ئەنجامـدا ڕەفێقـان بەشـەڕ هـاتن و ڕێوی گۆشتەکەی ڕفاندو بۆی دەرچوو وخواردی.

(٢ – وەکو کتێبی «مغنی المحتاج» لە باسی حەیوانی پاك و پیسا ئەیگێڕێتۆ: حەزرەتی شـافعی (خـودای لـیّ ڕازی بـیّ) لەگـەڵ کۆمەڵێکـدا لـە سـەفەرێکا لایـان دا بـۆ ئیـستراحەت. زۆر برسـیان بـوو، سـفرەیان داخـست و دوو مریـشکی ئامـادەی خواردنیان پیّ بوو و لـە سەر سفرە دایان نا. نوێژیان نـەکردبوو، وتیـان بـا نوێژەکـە

بکەین جا دوایی نان ئەخۆین. نوێژیان دابەست، ڕێوییەك
هات و یەکێك لە مریشکەکانی بردو خواردی. لە نوێژەکە بوونەوە، ڕێوییەکە شتێکی گرت بە دەمیەوە و خۆی نیشان دا. گشتیان ڕایان کرد بۆ لای ئەو شتە کە تووڕی دابوو، لەو کاتەدا ڕێوی پێچێکی لەخۆی داو هات و مریشکەکەی تری بردو خواردی.

(٣ - ساڵێك لە لای دێی دەرەوەرانی مەریواندا، لاکێك کەوتبوو و ڕێوییەك فێر بوو بوو و ئەهات بۆ سەر لاکەکە. ڕاوچیەکانی ئاوایی هەریەك لە نۆرەی خۆیانا ئەچوون و خۆیان حەشار ئەدا بۆ ئەوەی ڕێویەکە بکوژن. بەلاّم بۆیان ڕێك نەئەکەوت، ئەڕۆشتن بۆ حەشارو ڕێوی چاوی لێیانۆ بوو و تا کاتێك ئەچوونۆ نەئەهات بۆ سەر لاکەکە. مینە کەوەڵی دەرەوەرانی وتی: من لە ڕێوی فێڵ‌بازترم و ئەیکوژم. ڕۆژێ لەگەڵ کوڕەکەیا وتی: بڕۆین بۆ کوشتنی ڕێویەکە، کە کەوتنە دیارگای ڕێوییەکە بە کوڕەکەی وت: بمگرە بە کۆڵ و بمبە بۆ حەشارگە و بە جێم بێڵە. ئەویش گرتیە کۆڵ و بەجێی هێشت. ڕێویەکە نەیزانی دوو نەفەر بوون و هات بۆ سەر لاکەکە و مینە کەوەل ڕێویەکەی کوشت و حەقی ئیمامی شافیعی لە نەتەوەی ڕێوی سەند. «ئافەرین مینە کەوەل».

٧٠. ڕێوی سەر هەسێڵەکە مەبە. «ڕێوییە لە نێو هەسێڵێکدا تەماشای خۆی کرد لە ناو ئاوا، خۆی زۆر بە جوان هاتە بەرچاوو خۆی خستە ناو هەسێڵەکە و خنکا، بۆیە وتوویانە ڕێوی سەر هەسێڵەکە مەبە».

٧١. ڕێوی فێلاّوی، ژن مەکراوییە — پیاو گێل و فەقیر وەك مراوییە

٧٢. ڕێوی گورگی دی، سەمای لە بیر چوو — بۆ نەجاتی خۆی کەوتە هات‌و چوو

٧٣. ڕێوی نەئەچوو بە کونا، هەژگێکی ئەبەست بە کلکی خۆیۆ.

٧٤. ڕێوی وتی: من سەد فێڵ ئەزانم، وتیان کامیان لە هەموویان بە کەڵکتر بوو، وتی پێچۆ کردن.

٧٥. ڕێوی وتی: مەڵێن بۆ خۆی وا ئەکا، مریشك تەبیعەتی گەرمە، با کولێنەکەی لە دەرۆ بێ.

٧٦. ڕێوی هاتووە بە پیریتۆ. «واتە: تۆ ئەم مامەڵەتە بەکەڵك و باشە».
٧٧. ڕێوی زۆر ژانی ئەکردو بە قارە قاڕ ڕووی ئـەکردە ئـاوایی. ژنێـك کـە دووگیـان بوایەت و پێی ٧٨. بووتایە قوزەڵقورت، ژانەکەی ئەسرەوت.
٧٩. ڕێـوی هەڵگـەڕێتۆ لـە کونی خـۆی، گـەڕ ئـەبێ. «بەشەر لادا لـە ڕەسمی بـاوك و باپیری بێ
فەڕ ئەبێ».
٨٠. ڕێی بە ڕاسی و بەد بە خوا، سەربەرزت ئەکا لە لای خوا
٨١. ڕێ و ڕەسمی پێشینیان مەشێوێنە، ئەوان لـە ئێمە زاناترو دیندارتر بوون.

***

# پیتی ‹ز›

## پەندی پێشینان

١. زاڵـمـانی زوو، بـێ دیـنـانی دوون     «فَرِّقْ تَسُد» یان کردووە بە قانوون

«واتـە یـەکیـەتـی لابـەن لـە بـەینا     خۆت کە بە ئاغاو بێ خەم لەو بەینا»

٢. زامـــن ڕزق هەمـــووان خـوایـــە     کـە بەخێوکـەری کـول ماسـیوایە

٣. زامن یـا دەس بـە کیـسەیە، یـا دەس بـە یەخەیە.

٤. زانـا، تـۆ زانـای بە زانینـی خـــۆت     ئەعلا دەرەجەت وەرگرتوە بۆ خۆت

خـۆزگەم بەو کەسە کە ڕەفێق تـۆیە     بـەهـرە وەرگری تەعلیمات تـۆیـە

نەزان، نەزان بێ بـە نـەزانی خــۆی     نـەخۆشە و دەرمان نادۆززرێتۆ بۆی

جەهلی مورەککەب هیچ دەوای نیە     مـەپرسـە لە کەس کە دەوای چـیە

سەر مەنێ سـەری، سەر ئـەوەشێنـێ     بـە وتـەی نـاجۆر دڵت ئەتـەزێـنێ

نـەزان، زانـــا بـێ بـە نـەزانینـــی     پرسیـارە، ڕێـگـە و چـارەی زانینی

نەخۆشە، دوکتۆر ئـەو مامـۆسـایـە     لەگەڵ کۆشش خۆی ئەعلا دەوایە

٥. زانـا بی بـۆ خۆت یا خـۆ پرسـا بـی     تالّـب زانیـنی لە هـەر شوغـلا بی

«نامی»

٦. زانست و پیشە و تێکۆشیـن بۆ کـار     کۆمەڵی بێ سەر، ئەکەن بە سـەردار

«نامی»

٧. زانین دۆس هەموو کەسە و نەزانین دوژمنیەسی

باعیس بێ نان و ئاوی و باعیس نەبوونینیەسی

٨. زانیـن لـە دڵ منالّـدا وەك نـەخشـێکە لە بەردا

زەرەرمەن ئەو کەسەیە دەس لـە منداڵی بەردا

٩. زانین و توانیـن هەردوو بە کـەڵـــکە     هەرکامیان نەبێ ئەویان بێ کەڵکـە

١٠. زانیـن و توانیـن یەکانگیر بوو بۆت — سەر لیّ شیّواوی کار نەکەی بۆ خۆت
نەزان بی و بیکەی، کار زایە ئەکەی — بـۆخۆت دانیـشە، ناتـوانی بیـکەی

١١. زاوا میوانە، قڕ مریشکەکانە — زوو چۆ بەلایۆ، مەگرە بەهانە

١٢. زایفە داوێن خۆی دوژمنیەسی، بە تایبەت منالْ.

١٣. زیرە بردن بۆ کرمان و مازوو بردن بۆ زاگرۆس خەتایە. «زاگـرۆس دارسـانیّ کـە مازووی زۆرە»

١٤. زرێـار زووتـر زەڕیـن بـار بـووە — دەماودەم کەوتووەو وای پـیّ هـاتووە

١٥. زرێبارو بەهاری، بەهەشتی کوردەواری — ئەگەر بڕوام پیّ ناکەی، بڕۆ سەیرو دیاری

«هەژار لـە تەفسیرەکەیا لـە زۆر جێیدا بەحری بە «زریّ» تەرجمە کـردووە و «بـار» یـانیّ چکۆلـە. وەکوو ئەڵێن «رود بار» یانیّ: چەمی چکۆلـە. کەوابیّ «زرێبار» یانیّ دەریاچە».

١٦. زستان ئەڕوات و ڕوو ڕەشی بۆ زوخالْ ئەمێنێتەوە. «وەختیّ ئەمە وتراوە کە خەڵك موحتاج بە زوخالْ و قورسی بوون».

١٧. زستان خانە تەنگانەیە، مار لـە کونی خۆی نایێتە دەرۆ، تۆیش کەس لـە مـالْ خـۆت دەرمەکە.

١٨. زستان کە هەور ئەگرمێنیّ، ئەڵێن بەفر ئەڕووخێنیّ.

١٩. زستان ناو خۆی ها بە خۆیۆ، ئەبیّ کرێوە و بەفرو باران و سەرما و سـۆڵەی زۆری بیّ.

٢٠. زستان نوخشەی عیبادەتە، کەسیّ لـە نوخشەدا بیّ بەش بیّ ئەبیّ چۆن بیّ.

٢١. زل بەو زلْیە و قـورِ بـەو شـلـیـە — ناچەقێتـە قـورِ هـەتا هـەلْیـە

٢٢. زوانـت لادە، مـەینـیّ گـرەو کەس — لە تەرەف کەسۆ قەول مەدە بە کەس

٢٣. زوانـی بـەنـە، قـەڵـەم خـوایـە — نوقڵانە هەرجۆر بیـدەی هـەر وایـە

٢٤. زوانی لەگەڵ سـەریا شـەڕ ئـەکـا — بە هەموو جۆریّ قـسەی پـیّ ئـەکا

٢٥. زۆردار بلّیّ ماس ڕەشە تۆ مەلّیّ سپییە.

٢٦. زۆر بیّ قەبالّە بەتالّە، لازم ناکا بە قالّە، تۆ حەز ناکەی بنالّە.

٢٧. زۆر کاری گەورە، پیاوی بچووك ئەیکات.

۲۸. زۆر مەکە لە خۆت زیاد لە ئەنازە تەجرەبەی خۆت کە، جا ژن بوازە

۲۹. زوان ئامانە ئاوڕوو پۆشی دایم بۆ زەرەر ئینسان ئەکۆشی

۳۰. زوان بۆ زیکری خوا تێکۆشە دەرمانی دەردی ساق و نەخۆشە

۳۱. زوان کلیلی خێرو شەڕی ئینسانە

۳۲. زوان یەکێکە و گوێچکە دووانە یانێ یەك بلێی و دووان بزانە

۳۳. زۆرە لەو قوڕە ئەو تۆزە هەڵساوە

«نامی»

۳٤. زوڵفی لەسەر ڕوومەتی وەسفی بە لووسی ئەکا

هەر نەفەسێ هەڵخزێ وەی کە چ لووسی ئەکا

۳۵. زووخێز بە با هەموو شتێکت لە پێشۆ بێت. «لوقمان هەموو کارێکی لە پێشۆ بوو. وتیان بۆچی هەموو ئیشێکت وا لە پێشۆ، وتی: هەر کارێ قیامەتیم بێ، لە پێشا جێبەجێی ئەکەم و کارە دونیاییەکانیشم خوای گەورە بە جوانی بۆم جێبەجێ ئەکات».

۳٦. زەخمی شمشێرو خەنجەرو نەشتەر زوو خۆش ئەبێت و پێسی دێتە سەر

۳۷. زەخمی زوانی تیژو زەهراوی هەروا بە سۆیە هەتاکوو ماوی

۳۸. زەخمی شمشێرو نێزە سەهلە، زوو خۆش ئەبێتۆ

زەخمی نەشتەری زووان هەرگیز خۆشۆ نابێتۆ

۳۹. زردالو بیا گلو. «فارسییە، واتە: قەیسی بێ ناو دەمم، بێ زەحمەت کێشان تەمایەر هیچ خۆشییەك مەبە».

٤۰. زەڕ هەر بۆ سەری خەزێنە ئەچێ بۆ ماڵ فەقیرو هەژار کە ناچێ

٤۱. زەرەر لە نیوەشا بگەڕێتەوە هەر باشە.

٤۲. زەمانە لەگەڵ تۆدا ناسازە، تۆ لەگەڵ ئەوا بسازە و لەگەڵ خەڵکا ببە و یەك ئاواز بە.

٤۳. زەمانە هەر ئەو کات و ساتەیەکە ئێمەی وا تێدا، خەفەت بۆ ڕابردوو و داهاتوو مەخۆ.

٤٤. زەمانەی ئەنەن، حەیا نەمەنەن حەیا بارش کەرد، ڕووەش کەردە بەنەن

«هەورامییە»

٤۵. زەمانەی: «کەوا نان بخۆ» یە. «پیاوێ بە جلو بەرگی شڕو نالەبارەوە ڕۆیی بۆ

ماڵێ، نانیان پێ نەدا. ڕۆژێ تر بە پۆشتە و پەرداختی چاك ڕۆیشتۆ بۆ ئەو ماڵە، هاتن بە دەمیۆو نان و خۆراکی باشیان پێدا. ئەویش وتی: زەمانەی کەوا نان بخۆیە».

٤٦. زەماوەن تەجروبەی حەیاو شەرمی ئینسانە، بۆ تاوێ حەیای چەند ساڵەی خۆت مەبە.

٤٧. زەماوەن خۆشە، خۆشتر لەوە ئەوەتە کە زەماوەنەکە بۆ خۆت بێ.

٤٨. زەوی ئەم هەموو زەحمەتی سەرنشینەکانی قەبووڵ ئەکا، تۆیش لە خاکی، هەر وابە.

٤٩. زەوی گەنجە، بەو شەرتە ڕەنجی لەگەڵ بدەی.

٥٠. زیرە بۆ کرمان مەبە و خورما بۆ بەم. «ئەڵێن ئەو دوو شارە زیرە و خورمایان زۆرە».

٥١. زیرە بۆ کرمان بردن خەتایە     زیرە لە کرمان وەکوو کا وایە

٥٢. زینەت و زیوەر ژنان حەیایە     دونیا هیچ نیە هەر «کا» و هەر «با»یە

مانعی بەلا و گوناح، حەیایە

٥٣. زانین، لای زانا ئاشکرا مەکە     خۆت تووشی لەکە و عەیب و عار مەکە

٥٤. زستان شەوێکی بمێنێ کاری خۆی ئەکا.

***

# پیتی ‹ژ›

## پەندی پێشینان

١. ژن ئەساسی ئیستراحەت و دڵ ئارامی پیاوە.

٢. ژن ئەگەر ڕایێ خراپی بکا، بیبەخشە بە کارە چاکەکانی. «حەدیسە»

٣. ژنان بە چی ئەناسی، بە داوێنی کراسی.

٤. ژنـــی داوێـــن پـــاك کـــەم و نایابـــە     ژنـــی داوێـــن پـــیس زۆرە و خراپـــە

٥. ژن بـــە ئـــارامی هەرچـــی کـــار ئەکـــا     کەر بە چرپۆ باز هەرچـــی بـــار ئـــەبا

٦. ژن بێ باوەڕیشە و خۆش باوەڕیشە.

٧. ژن بۆخۆی چێشت لێ ئەنێ، هەرجۆرێ بێ شوکری خوا بکە و بیخۆ.

٨. ژن بە بێکەس هار ئەبێ، پیاو بە بێکەس هەژار ئەبێ.

٩. ژن بدە بە ژن مردوو، گا بدە بە گا مردوو.

١٠. ژن بە قەرز نابێ. «واتە: قەرزی بێ جێگە مەکە بۆ ژن هێنان».

١١. ژن، بەنەخوێنی شل بێتۆ، شووەکەی لە سەفەر بێتۆ، باشە بیری لێ کەیتۆ

١٢.

ژن بـێـنـە لـەبـۆ مـالـت     ئـەمـە بـاشـە بـۆ حـالـت
ئەگەر بە گوێی من ئەکەیت     گـوێ گـرە بـۆ نـالـە نالـت
کچت زوو بـدە بـە شـوو     بـەبـێ وچـان و پـشـوو
ئەگەر تـۆ نـەیدەی بە شوو     هات و خۆی خۆی دا بە شوو

١٣. ژن پەرستی خوا پەرەستی لە بیر ئینسان ئەباتۆ، بڕوای پێ مەکە و برۆ بە ڕێتۆ.

١٤. ژن پێچە، مەشوەرەتی پێ کەن و بە گوێیان مەکەن، چون عەقڵ و دینیان ناقسە.

١٥. ژن تا منالی نەبێ لەگەڵ شووەکەیدا وەکـوو بێگانـە وایـە، کـە منالیـان بـوو ئـیتر یەکدڵی و مەحەببەتیان بۆ یەك بێشکە ئەبێ.

١٦. ژنتان هانی با بزۆك بێ، ژنی نەزۆك لەگەڵ شوو دڵیان بێ ئارامە.

١٧. ژن داوی شەیتانە بۆ زەلیل کردنی پیاو، خۆت مەخە داویان. «حەدیسە»

١٨. ژن دز و حیز بێ، چاری ئاسانە | بێ حەیا گشت کەس لێی هەراسانە
هەتاکوو ماوە لە دەم ناکەوێ | ڕەفیقی ساتێ بێ خەم ناخەوێ
هەتا ئەتوانی دوور بە لەوانە | دووری لە بەلا و مەینەت ئەوانە
١٩. ژن کچی شوو کا، دەماخی سازە | کوڕی ژن بێنێ کزو لاوازە
٢٠ ژنیش هەس و ژانیش هەس.

٢١. ژن قسەی ڕاسی لەگەڵ شوو کەمە. «وەختێ حەزرەتی ئادەم و حەوا «علیهم السلام» لە بەهەشت دەرکران و هەریەکێ کەوتنە شوێنێ، ئادەم هەموو ڕۆژێ تا ئێوارە ئەگەڕا بە شوێن حەوادا، حەوا کە بێ ئارامتر بوو بە شەویشدا هەر ئەگەڕا، وەختێ لە عەرەفاتی "مەکەدا" بە یەك گەشتن، ئادەمﷺ وتی: لەوساوە لەیەك بڕاوین هیچ ڕۆژێك ئارامم نەبووە و تا ئێوارە بۆ تۆ گەڕاوم، حەوا وتی: من لەم جێگای خۆما دانیشتبووم».

٢٢. ژن کە هەسانی پیاوە تیژو کرژی ئەکاتۆ | خەفەتی تازە و کۆنەی هەموو لە بیر ئەباتۆ
٢٣. ژن کە نەتوانێ ، تۆڵەی خۆی بسێنێ ئەگرییێ.

٢٤. ژن لەبەر چوار شت پیاو ئەیخوازێت: یا لەبەر جوانی، یا لەبەر ماڵداری، یا لەبەر عەشیرە داری، یا لەبەر دینداری. دیندار بخوازە با نەکەوی بە ئەرزا. «حەدیسە»

٢٥. ژن لە پەراسووی چەپ درووست کراوە، ڕاسی کەیتۆ ئەشکێ. «حەدیسە»
لە پەراسووی چەپ حەزرەتی ئادەم | حەوا درووس بوو بە حەدیس خاتەم
پەراسوو، ڕاسی ئەکەیتۆ ئەشکێ | سازش باشترە هەتاکو بشکێ
شکاندنی ژنان، تەڵاق دانیانە

٢٦. ژن لە تایفەی باش بخوازە، منالەکانت خالۆ وەڵەد ئەبن.

٢٧. ژن لە لادێدا کۆڵەکەی ماڵە | بێ وچان مانووی چوار فەسڵی ساڵە
لە شار خەریکی بنێشت جاوینە | فەرق ناکات زستان، یا خۆ هاوینە
٢٨. ژن لەلای باوان، کونە لای ئاوان | قەدریان نیە، لێم مەگرە تاوان
٢٩. ژن لە ماڵ شوویا خۆشی بێ، بە کۆڵ بەرد ئەکێشی.

٣٠. ژن لیباسی پیاوە و پیاو لیباسی ژنە، یەکتر لە سەرماو گەرمای هەر دوو دونیا ئەپارێزن.

«لە ئایەت وەرگیراوە».

٣١. ژن مالاَن‌گەڕو ماڵ ویران‌کەر نگاداری مەکە با ئابڕووت نەچێ.

٣٢. ژن مـــەلّهـەمـێـکە بـۆ زام و بـرین          وەك حەسار وایە بۆ حەیا و پەرژیـن

٣٣. ژن و مالّیان وتووە، نەیان وتووە ماڵ و ژن.

٣٤. ژن و پیاو کە لـە یەك ڕازی بن و تەلاّقیان نەبێ ئەلّێن:

من ڕازی و تۆ ڕازی          داریٚ بە قنگی قازی

قازیش دوژمنیانە کە ئەلّێ: تەلاّقیان نیە، زۆرتر ئەم زەمانە وەهایە و بێ تەلاّق ژن و پیاو بە لای یەکۆ دانیشتوون.

٣٥. ژن وەسە دار «بی» لـە هەرکوێی داینێی سەوز ئەبێ.

٣٦. ژن وەختی شووی هات و هاوشان داوای کرد، بێ وچان بیدەنێ. نوێژ وەختێ هاتە پێشۆ بیکە با دلّت ئارام بێت. کەسێ مردنی مەعلووم بێ، زوو بیشارەرۆ. «حەدیسە»

٣٧. ژن وەختێ منالّی ئەبێ، باشترین دەواو خۆراکی، خواردنی خورمایە. «حەدیسە»

٣٨. ژن وەسە گوێز، هەموو کەسێ بەردی پیا ئەخاو بۆ هەموو کەسێ نابێ.

٣٩. ژن هـات و دایـە لای بـێ حـەیایی          بـە دار بیلـــەکان زەوی مـــەگایی

٤٠. ژن خانەداربێ، پیاو کاسب کار بێ          بـا بـێ حەیا بێ یا شێت و هـار بێ

٤١. ژنی پـیــرو پـیـاوی جـوان          ئۆخەی ئۆخەیە و گیان گیان

پـیـاوی پـیـرو ژنـی جـــوان          قـوزلـّقـورتـە و سیا سـنــان

٤٢. ژن هانین سەهلە، بەخێو کردنی گرانە، بەرلـەوە تەئمینی گوزەرانی بکە.

٤٣. ژنیان ژن وتووە و پیاویان پیاو، ئەبێ هەریەك خەریکی کاری خۆیان بن.

٤٤. ژنێکت بۆ ڕازی نابێ، چۆن دوو ژن ڕازی ئەکەی، لایبە ئەزیەت خۆت مەکە.

٤٥. ژنێك ژیر سێ منالّی بوو، وەختی نان خواردنیان تـەنیا سـێ نانیـان بـوو، بـە هـەر یەکێکیان نانێکی داو وتی: من قوزەلّقورتم ئەخوارد، یەکێ لـەتێکم پـێ بـەن. بـەوجۆرە خۆی بێدەنگ نان و لـەتێکی خوارد.

٤٦. ژنێ گون دابێلّێ بەسەرتا، بەخێو نابێ. «مەیەلّە».

٤٧. ژنێ گەرەکی بوو شووەکەی فێرە جوێن بکا، نەیئەوێرا، ڕۆژێ منالّەکەی بەهانـەی پێ گرت و ئەگریا، وتی بە شووەکەی: تۆ خۆت بکە بە گورگ و بلوورێنە با ژیر بێتـۆ،

کە لووورانی وتی: مەگری ڕۆڵە ئەگەرنا گورگە باوەحیزەکە ئەتخوا.

٤٨. ژنێ مارە نەکرابوو، داوای هەشتیەکی ئەکرد.

٤٩. ژنی مالآن گەڕ، یا کۆڵ دێنێ یا زۆڵ.

بڕوام پێ بکە بە باشی زانە ژنی مالآن گەڕ ژن نیە، ژانە

٥٠. ژنی مێردان، لە بنی بەردان. «پیاوی لێ هاتوو لە بن بەردیشا بێ ژن بە خێو ئەکات».

٥١. ژنێ نەخۆش بوو، وتی بە شووەکەی: خەمی خۆم نیە ئەمرم، من بمرم تۆ چی ئەکەی؟ شووەکەی وتی:

خوا نەکا نەمری ئەبێ من چی بکەم داخ و خەفەتم چۆن لە دڵ دەرکەم؟

٥٢. ژنێ وتی بە کوڕەکەی: ڕۆڵە تۆ گلەیی باوکت لە من مەکە، باوکت گای جووت کردنە، خزمەتی زۆری ئەوێ.

٥٣. ژەم ژەم و کەم کەم تۆ خۆراك بخۆی بێ دەنگ و بێ وەی خۆت بەخێو ئەکەی

«ژەم ژەم و کەم کەم، واتە: کەم خۆرو هەمیشە خۆر بە».

٥٤. ژەمێ و سێ ژەم. گورگ تا ژەمێ تێرە، دوو ژەم برسیەتی.

«ئەو وشانەی کە «ژ» یان واتیاو چەند جار دوبارە کراوەتۆ زۆرن، وەکوو: ژیژك، ژیژوان، ژریژە، ژاژ، ژەمژەم، ژوژ، ژەرەژ، ژلێژاو، گێژو ویژ، ژاوە ژاو، ژن و ژن خوازی، ژن بە ژن، مژمژە، ژیرو ژوڵ، هووژە هووژ، هاژە هاژ...

***

# پیتی < س >

## پەندی پێشینان

١. ساقمان بە کۆڵ کەر ئەگەڕێ، ئەونە نەخۆشین
جارجاریش بۆ یەك ئەیکەین گریە و شین

٢. سایە پەروەردەی، سووری دڵبەری — کاسە نەشۆری، ماڵ وێران کەری

٣. سایلەیش دەم ئەسووتێنێ!.

٤. سپێ لە مشتیا سەرچۆپی ئەکێشێ. «ئەوەندە لاتە».

٥. سەحەرخێز بە تا بە مورادو ئارەزووی خۆت بگەی.

٦. سورنا بدەی بە دەس ناشیۆ، فوو بە سەرە گەورەکەیا ئەکا.

٧. سمۆرە وتوویەتی: من لە ئاو پاییز ناخۆمۆ کە چیاوو خۆشە، ڕەعیەت لێی ئەخواتۆ.
ئەڵبەتە جارِ عەشرەتی ئەکێشێ.

٨. سمێڵ هەر پیاوێ نابێ لە برۆی زیاتر بێ.
چونکوو وا لە بەین دوو کون حەساسا — حەزرەت بۆ ئەوە داینـاوە یاسا

٩. سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار.

١٠. سوار لەسەر زین دێنێتە خوارۆ. «ئەوەندە بێ حەیایە».

١١. سووکی ژن لەبەر بێ چارشێویە — بڕوا بۆ هەر کوێ موشتەری نیە

١٢. سەبرت بێ کار درووس ئەبێ.

١٣. سەبر کلیلی دەرگای خێرە.

١٤. سەد تمەن ئەدەم و شەوێ منالەکەم لە دەرۆ ڕۆژ نەکاتۆ. «لەو وەختا سەد تمەن زۆر بووە».

١٥. سەد سەری براو بێنی و بینیتە بەردەسی بە زامن.

١٦. سەد قەلوبەردێ تونایان ئەکا — هەریەکێ بۆخۆی چارەسەر ئەکا

١٧. سەد گوناح و یەك تۆبە.

١٨. سەرئەنجام گا هەر دۆڵە.

١٩. سەر بێ دەلاك مەتاشە / بۆ خۆت هەروەها باشە
ئەگەر تۆ پیاوێ زیرەك و باشی / سەر مەنێ بەر دەس دەلاکی ناشی
با سەرت بە تێخ لەت و پەت نەکا / ئەملاولای سەرت خوێناوی نەکا

٢٠. سەر دائەپۆشێ و قنگی ئەفرۆشێ.

٢١. سەر دەستە، زەحمەتە بێت بە ژێر دەستە.

٢٢. سەرم بشکێنە و نرخم مەشکێنە.

٢٣. سەرم بووە بە ئاش، قنگم بووە بە ماش. «واتە: سەرم جەنجاڵە. ماش، تەیمانێکە لە بەر ئاوا درووسی ئەکەن بۆ ماسی گرتن».

٢٤. سەر مەنێ سەر شێت، باقیارت ئەکا / بۆ هەر دوو دنیا لەکە دارت ئەکا

٢٥. سەرو ماڵم لە تۆ درێغی نیە / بزنە کوڵم لە چوار شایی کەمی نیە

٢٦. سەگ هار چل ڕۆژ عومر ئەکا.

٢٧. سەری بڕوا نوێژی ناڕوا. «ئەوەندە بە تاعەتە».

٢٨. سەری بێ تاوان بچێتە پێی دار / نەجاتی ئەبێ و نادرێ لە دار

٢٩. سەری لە هێلکە نەجووقانووە / ئەونە بە نازو نووزو بیانووە

٣٠. سەری من بە قەد پای تۆ نازانێ / حازرە سەرم، پێی لەسەر دانێ

٣١. سەرێ نەبێ لەناو سەرانا بۆ بڕین باشە.

٣٢. سەگ بە حەوشەی پێ ئەکەین، جا ئەملاولای لێ ئەگرین بە دارو بەردەوە.

٣٣. سەگ کە برسی بێ هەمیشە وا بە شوێنتۆ، کە تێر بێ ئەتخوات، نۆکەریش هەر وایە.

٣٤. سەگی سپی کە گلاوە بۆ بارە لۆکە زەرەری هەیە.

٣٥. سەندن بە مسقاڵ بەخشین بە خەروار / وا باشە لەبۆ فەقیرو هەژار

٣٦. سەیید وەنە دێزەی ڕەش، بۆ ژن و ژن خوازی نزیکیان مەکەوە.

٣٧. سیاسەت باوك و دایکی نیە، هەر ڕۆژێ بە جۆرێ ئەگۆڕێ.

٣٧. سیاو چەمانە، سیاو چەمانە / هەورامان یاگەی سیاو چەمانە
«سیاو: ڕەش. چەم: چاو»

۳۸. سیروان لێشت نەدەم، هەر ئەمبەی.

۳۹. سێ شت بنچینەی عومری پیاو دەردێنێ، هاوسەری پیرە ژن، قەرزکردنی بێ جێ، خەفەت خواردنی زۆر.

٤۰. سێ شت زینەتن بۆ سێ شت: حەیا بۆ ژن، عیبادەت بۆ جوان، تۆبە بۆ پیر.

٤۱. سێ شت ئافەتن بۆ سێ شت: غروور بۆ جوان، ڕیا بۆ عیبادەت، منەت بۆ ئیحسان.

٤۲. سێ شت سەبەبە بۆ ئەوەی کە بەشەر زوو پیر بێ: ڕەفیقی ژنی نەساز، بێ ڕەحمی و بێ باکی و بێ حەیایی کەس و کار، دەس تەنگی و ناتەواوی ژیان.

٤۳. سێ شت کە وەفای نیە بۆ ئینسان — ئەسپ و سیلاحە و گرۆهی ژنان

٤٤. سێ شت لا ئەبەن خەفەت لە ئینسان — ئاوو سەوزەجات، مەنزەرەی جووان

٤٥. سێ شت لا ئەبەن خەفەت لە گیان — ئاوو سەوزایی و ڕوومەتی جوان

٤٦. سێ شت مەفسەدەن بۆگرۆی ئینسان — جوانی و بەتاڵی و سەروەت و سامان

٤۷. سێ شت نیشانەی نیفاقی عەبدە — درۆ، خەیانەت، خیلافی وەعدە

٤۸. سێیەمینە سوننەتە، «بەجێی بێنی باشە».

٤۹. سینەی بێ کینەی موحەممەد سەڵوات. «لە وەختی ناوجی کردنا خەڵك وا ئەڵێن».

٥۰. سێ و دووی دڵی خۆی ئەکا، دوایی مەشوەرەت ئەکا، جا ئیقدام بەکار ئەکا.

٥۱. سێوێ هەڵخەیتۆ نایێتە خوارۆ، چەن جار بەدەور خۆیا ئەخولێتۆ. «دەوری زەمانەش هەر ساتێ جۆرێکە».

٥۲. سێوێ خۆی نەگرێ لەبەر سوەیلا — نابێ بە وێنەی سەر گۆنای لەیلا

«نامی»

***

# پیتی <ش>

## پەندی پێشینان

١. شا بەخشیویەسی، شالیار نایبەخشێ.

٢. شاڵ من و شاڵ خانە. «واتە: با شاڵەکان لەیەك بن، هەر شاڵ ئەو پەسەنترە».

٣. شالیار بە کالیار نازانم. «ئەوەندە بە خۆما ئەنازم، شاو شالیارم بەلاوە وەکوو یەك وایە. ئەونە بێ خەم و بێ باکم».

٤. شانــازی بــە مــاڵ دنیــاوە مــەکــە ... هەرچەن مـاڵ دنیـا ئـەتبا بـۆ مەکـە
چـون مـاڵی دنیـا چـڵکی دەســانە ... قەناعەت یـاسای گـەورە کــەسانە

٥. شای مێوە هەنگوور، سوڵتان خـەربوزە ... شووتی هـەر ئاوە و خەیار بێ مەزە
ئـەگــەر نـازانی خـەربـوزە چیـــە ... کـاڵەکە، ئـیتـر ئـەوەی بـۆ چیە

٦. شانامە کوێی خۆشە؟ ئاخری!.

٧. شا وەکوو شوانە، ڕەعیەتیش ڕانە. «گـورگ لـە زاڵمەکانـە، شـوانێ کـە کۆمـەك گورگ ئەکا، ئیتر مەرگی حەیوانەکانە».

٨. شایەن بازی مەکە! بۆ خۆت قورس بیکێشیت و بۆ خەڵك سووك، «با وەیل جێگەت نەبێ».

٩. شایی و شیوەن بە قەوم و عەشیرەتۆ خۆشە، با بێگانە پێیان خۆش نەبێ.

١٠. شایی و شیوەن دەسەوامە.

١١. شتێ گۆشتی پێ ناگرم، بۆ گۆشتی پێ کەم کەم.

١٢. شلپەی ئاو تێ، مێمانمان تێ. «تەجرەبەی زووە».

١٣. شمشێر چاك لە ئاسنی خراو درووس نابێ. «نا ئەهل بە مۆجگاری تۆ ژیر نابێ».

١٤. شمشێر میسری لە کێلانا خۆی ناگرێ، «پیاوی جەوهەرداریش لە مەیدانا خۆی بـۆ ناگیرێ».

١٥. شمشێرو ئەسپ و ژن کە بێ وەفـان ... هـەر ڕۆژ یەکێکـە سـاحێبی ئـەوان

۱٦. شوانی ناپاك، لە گورگ خراپترە.

۱۷. شوان گرتن ڕاسی هاوماڵە، سەرۆکیش بۆ میللەت هەر وایە.

۱۸. شوان لە شوانیەکە عاری نیە، لە نانۆ چنین عاریەتی. «ئەمە نیشانەی نەگبەتییە»

۱۹. شوانە درۆزنەکە مەبە، با خەڵك بێن بە دەمتۆ.

۲۰. شوانی حەیوان، ئەوەڵ کاری پێغەمبەران بووە تا تەجرەبەیان بێ بۆ شوانی ئینسان.

۲۱. شۆرەت بۆ ئینسان ئافەتە، تۆ شۆرەت پەرست مەبە.

۲۲. شوکری نیعمەت نیعمەتی تۆ زیاد ئەکا — کوفری نیعمەت هەرچی هەس بەربای ئەکا
شوکری نیعمەتی خوا زۆر ئەکەم — کە زۆرم نیە، ئازاری کەس کەم

۲۳. شوان تا دانیشێ ڕانی دوور ئەکەوێتۆ.

۲٤. شووشە (شیشە) کە شکا، جێی خۆی ناگرێتۆ، «تۆش هۆشت بێ بە خۆتەوە و قەدری خۆت مەشکێنە».

۲٥. شوویێ کافر لە هەزار برای موسوڵمان باشترە. «خۆشکێ وا ئەڵێ کە بە گیر هاتیێ بۆ شوو کردن».

۲٦. شەخس تا زەبەرەی خۆی نەنوێنێ، دانوولەی بۆ لێ نانێن. «جافێ چووە سەر مەرقەدی کابلە سوورەی مەریوان و وتی: حەمەی کوڕم نەخۆشە، دۆعای بۆ بکە بەڵکوو خۆشۆ بێتەوە، گێسکێکت بۆ ئەکەم بە خێر. ئەگەر تۆ خۆشی نەکەیتۆ مەحووی سەرەواڵە بە دیزەیەك دانوولە کرە ئەکا».

۲۷. شەڕ ئەکەی بیر ئاشتیت پێوە بێ.

۲۸. شەڕ ئەکرێ بە فێڵ و ناحەق سەر ئەکەوێ بە بەرتیل. «دوانزە سووارەی مەریوان هەر یەکە دوو تەپەڵەیەکیان دابەست بە کەڵپۆس زینی ئەسپەکەیاناو بە شەبیخون هەریەك لە قولێکۆ دایان بە سەر تەواوی عەشیرەتی جاف لە دەشتی پێنجوێنا، جافەکان وایان ئەزانی دوانزە هوردوو هاتووەتە سەریان، شکان و ئەوجارە بەو جۆرە مەریوانی نەجاتیان بوو بە دەس شەڕی جافۆ».

۲۹. شەرابی مفتە، قازیش ئەیخوا.

۳۰. شەڕ بە ئەسڵەحە ئەکرێت و مامەڵە بە پوولێ.

٣١. شەڕ بە کۆنە قین ئەکا.

٣٢. شەڕت پێم مەفرۆشە، مەڕت لە لاما مەدۆشە.

٣٣. شەرتە کەڵەمەت بجەڕێنم. «واتە: زەلیلت ئەکەم. هەڕەشەیە. کەڵەمە: دارێکە کە لە وەختی
جووتا ئەیبەسنە مل گاو بەوجۆرە ڕام و زەلیلی ئەکەن».

٣٤. شەڕ خۆش نیە، شەڕنامەکەی خۆشە کە بە ئیستراحەت بیگێڕیتۆ.

٣٥. شەرع بنی قووڵە، شەرع جەبەڵ جەبەڵە، «کەس بە تەواوی نایزانێ».

٣٦. شەرع مار بە دار، بە خۆت یا بە زۆردار.

٣٧. شەڕ کراو کوژاوۆ | کەچەڵ بۆ دار ئەسووڕاوۆ

هیچ مەنعی ناکەم لەحەیبەت سەری | ناچێتە بەرۆ بۆ دەردی سەری

٣٩. شەڕکە لە شێفو ئاشتیلە خەرمان | با دوایی نەبێ بە بەزم و شەڕمان

٤٠. شەڕو نیوە شەڕ، هەر بران.

٤١. شەڕ لە بەتاڵی باشترە. «شەڕی شەوی ژن و مێرد مەزەنەی خراپی لێ ئەکرێ، نەیکەن باشە».

٤٢. شەرم و حەیا بۆ ژنان، ژنان حورمەتدار ئەکا
بێ حەیایی و بێ شەرمی ژنان لەکە دار ئەکا

٤٣. شەرم و حەیا خۆشبەختی هەر دوو دونیایە.

٤٤. شەرم و حەیای ژن، هۆشیاری حیجاب | ژن ماقووڵ ئەکا بێ حەدو حیساب

٤٥. شەڕ نان و گۆشت خواردن نیە، پەن و پیتکەی زۆری لێ ئەبێتەوە.

٤٦. شەڕ ناو خۆی ها بە خۆیۆ، تەمایەر خێری مەبە.

٤٧. شەڕە زەڕنگەڕانەیە، هەردەم قاڵەیانە، لە یەکتر نادەن و ناکەن.

٤٨. شەڕە منالْ وەسە شەڕە مریشك، دوو دەنووك ئەدەن لە یەکترو جیا ئەبنەوە.

٤٩. شەڕێ ببێت و خێری تۆی تیا بێت خۆشە.

٥٠. شەڕی خۆ ترێن مەکە.
لەگەڵ نا ئەهلا شەڕو ستیزە | ئابڕووت ئەباو ئەتخا لە ڕیزە

«نامی»

٥١. شەڕی ژن و مێرد وەسە شەڕی منالاّن، زوو ئاشتی ئەکەوێتەوە بەینیان.

٥٢. شـەریعەت ڕێگـا، تەریقـەت بالـّـە    بـەبێ شـەریعەت تـەریق بەتالـّـە

٥٣. شەق ئەزانێ قوّناخ وا لـە کوێ.

٥٤.    شەلان بە کـوّڵێ جـەوتۆ    هەر هەڵئەساو ئەکەوتۆ

٥٥. شەلـکەی پا شکاو نیە، ئەو ژنە هەر موشتەری زۆرە.

٥٦. شەلّلا ئەو شەوە دایکت تـۆی ئـەبوو، مـن لـە ئاشا بـووایێم. «کەسـێ کـە لـە کوڕەکەی یا کچەکەی بێزار بێ وا ئەڵێ».

٥٧. شەل نیە، پای شکاوە.

٥٨. شەلە باوان و کوێرە باوان.

٥٩. شەلـە مارت ئەکەم وەك مار ئـەتکوژم    هەر وەکوو دوژمن خـوێنت ئـەمژم

٦٠. شەمامەی بێستان، بۆ دەس چاو مەستان.

٦١. شەلـەم داویە لـە کەلـەم، بۆیە ئەونە بە پەلـەم.

٦٢. شەلـەم شیرینی ئەکا، ئەرنا خۆیشی حەز ئەکا.

٦٣. شەمشەمە کوێرە، گیاندارێکی زۆر عەجایبە. هێلکە ناکا، بەچکەکەی بە شیر بەخێو ئەکاو لـە ڕۆشنایی ڕۆژدا لـەبەر تیژی خۆر چاوی نابینێ و لـە تاریکی شەویشدا زۆر چاوی تیژە و زۆرتر لـە بەینی مەغریب و عیشادا دەرئەکەوێ و تەنیا پەلـەوەری گوان دارە.

٦٤. شەممە بە کەم کەسێ کەوێ، هەر بۆ مووسایی باشە.

٦٥.    شـەمـمـە کـارو شـەمـمـە بـار    شـەمـمـە بـووك نـاکـرێ سـوار

٦٦. شەو بێداری، دڵی بەشەر هۆشیارو ڕووناك ئەکاتەوە و زۆر خەیاڵاتی لـە بیر ئەباتۆ.

شـەوەن خەڵوەتەن، ماڵ بێ ئەغیارەن    عالـەم گرد وتەن، دۆس خەبەردارەن

«مەولـەوی»

٦٧. شەو، سات و کاتی بەندەگی خوایە، با لـە خەڵوەتا بین و لـە زیکری خوای خۆماندا بین.

٦٨. شەو شەوی بەراتێ، خوا کچ و کوڕتان باتێ، شتێکمان بـۆ خەنـە جـەماتێ. «زوو منالاّن لـە نەورۆزا ماڵ بە ماڵ ئەگەڕان بۆ نەورۆزانە و ئەم شـیعریانە ئەخۆنـدو خـەڵکیش

هەرچی دەسیان ئەڕۆیی لە هێلکە و پارە و خورماو شیرینی پێیان ئەدان».

٦٩. شەوقی تەرزە مێو، گەلای گایمە — چەپۆك باوە ژن هەر لە یادمە
چەپۆك باوە ژن کلاوەکەی دڕیم — کە باوکم هاتۆ فرمێسکی ئەسڕیم

«کوڕێك هەمیشە بە کۆڵ باوەژنیۆ بوو، مەشهوور بوو کە چەنێ خۆشی ئەوێت. ڕۆژێ خۆشکی وتی: دادە تۆ بۆچی ئەم کوڕتە ئەوەندە خۆش ئەوێ کە دایمە ها بە کۆڵتەوە. وتی: خۆشکە گیان با قسەی خۆمان بێ و کەس لە دەمت نەبیسێ، لەبەر ئەوە ئەیگرمە کۆڵ با چاوم پێی نەکەوێت و چاوم لە ناو چاویۆ نەبێت».

٧٠. شەوان کە کاتی بەندەگی خوایە — ڕازو نیازو ئەسراری تیایە
بە شەو لە یادی ئەو غافڵ مەبە — دوور لە ڕسوومی ساڵحان مەبە

٧١. شەوگار درێژە و عەوداڵ بەتاڵە — بۆیە هەر خەریك ئەم ماڵ ئەو ماڵە

٧٢. شەوگارمان ڕۆیی، ڕۆژگارمان ماوە — با جێ بە جێ کەین چی ناتەواوە

٧٣. شەیتان سەری لێ دەرناکا، ئەوەندە پێچە.

٧٤. شەیتان بە ئەوانە گەمە ئەکا کە تووڕەن، خۆت مەکە بە گەمە جاڕ شەیتان.

٧٥. شەیتان پەلەی کرد چاوی خۆی کوێر کرد. «بۆیە وتوویانە عەجەلە کار شەیتانە».

٧٦. شەیتان شەرم لە مووی سپی ئەکا، ئێمە ئەبێ باشتر شەرمی لێ بکەین.

٧٧. شەیتان وتوویەتی هەرکەسێ بە بەشی خۆی ڕازی نیە، بێتە جێگەکەی من با تەوقی لەعنەت کرێتە ملی.

٧٨. شێخێ کە ماڵی دنیا کۆ کاتۆ — بۆ ماڵۆ لەگەڵ خۆیا بیباتۆ
هەرتا ئەتوانی لە دەسی ڕاکە — بڕۆ شێخێ تر بۆ خۆت پەیا کە
دنیا لاکێکە سەگە تاڵبی — وا نەبی بەسەر نەفسا غاڵبی
هەرکەس تەسلیمی شەریعەت نەبێ — شێخ نیە هەرگیز، بڕوات پێ نەبێ

موفتی زەهاوی بە فارسی وای فەرمووە:

شیخا کە تو در عالم ظاهر فردي — این رتبە ز دستار بە دست آوردي
حیف است کە او دور سرِ تو گردد — بایـد کە تورا دور سرِ او گـردي

٧٩. شێر ئەگەر بتخوا، پەنا بە لانەی ڕێوی مەبە.

٨٠. شێر بتشکێنێ نەك ڕێوی بتخوا      هەمیشە ئەمە داوا کە لە خوا

٨١. شێر بتخوا مەدە لە پردی نامەرد.

٨٢. شیر دایك لە هەموو شیرێك باشترە بۆ منالّ.

٨٣. شیر کە دۆشرا ناچێتۆ ناو گوان      قسە لە دەم دەرچوو ناچێتۆ سەر زوان

٨٤. شێر لە بێشە بێتە دەرۆ چ نێر بێ و چ مێ، دەسی خۆی ئەوەشێنێ. «بێ خەم مەبە».

٨٥. شیرم بە تۆ حەلاڵ بێ ئەو کارەم بۆ بکە. «دایك منالّی خۆی وا هەلّئەنێ بۆ ئیش کردن».

٨٦. شیرەوا گەزێ بەفری بەسەرۆ بێ، بڕوای پێ مەکە، دەمت ئەسوتێنێ. «نەفەرێ شیرەوای خواردبوو و دەمی سووتا، سەری بەرزۆ کردو وتی، ئەم مالّە بە چەنێ دروس کراوە؟ وتیان: بە سەبرێك و دوو فوو».

٨٧. شیر وشترو دیار عەرەب. «بۆ نفرین وا ئەلّێن».

٨٨. شێری یا ڕێوی؟ «کەسێ بڕوا بە شوێن کارێکاو کارەکە بێت بە دەسیۆ، شێرە و ئەگەر کارەکە نەیێت بە دەسیۆ، ڕێوییە».

٨٩. شیعر هەرکامی درۆی زۆرتری تیا بێ، بە لەززەتترە. «حەدیسە، بۆیە پێغەمبەرﷺ شاعیر نەبووە».

٩٠. شینی فەرهادم تەمام نەکەردەن      شینی کەیخەسرەو ئامان بە گەردەن

٩١. شین هەر بەسەر مردوودا ئەکرێ، تا بەشەر لێی نەقۆمێ، شینی بۆ ناکرێ.

***

# پیتی <ع>

## پەندی پێشینان

١. عـادەتی پیـاوی گـەورە، گەورەتـرین عـادەتـە
شوێن کەوتنیان بۆ ئێمە سەربەرزی و سەعادەتە

٢. عاشق گوڵ وا بە دەسیۆ، عارف وا لـە باخەڵیا
ئەبلەهـ ئەیبنێ بە سەریۆ، بـێ نەوا لـە کـەمەریا

٣. عاقیبەت خێری لـە هەموو شتێ باشترە. «هەموو ڕۆژێ خەریك خۆ خاس کردن بـە، نەکا ئەو ڕۆژە ئاخر عومرت بێ».

٤. عالم هەر ئـەو کەسەیە خۆی بگرێتۆ لـە حەرام
نەك مەنعی خەڵکی کات و خۆی هەڵکێشێ لـە حەرام

٥. عالـــمی چـــەنێ ســـەهل و ئاســـانە عاقـــڵی ئەونـــە ســـەخت و گرانـــە

٦. عیسا بە دین خۆی، مووسا بە دین خۆی.

٧. عالـمێك لـەبەر چاو شەیتانا لـە سەد عابید بە هەیبەتترە. «حەدیسە»

٨. عالـەمتان دا بە فیڕۆ، خۆتان وەکوو بەرزی بانان دەرچوون لـەم شەڕا کە ناتانۆ.

٩. عالـەم دەوامـی بـە چـوار شـتە: ١- عیلمـی عالـمان ٢- عەدالـەتی حاکمـان ٣- سەخاوەتی دەوڵەمەندان ٤ - قەناعەت و دۆعای خێری فەقیران. «ئەمانـە کـە فـەوتان، عالـەم ئەفەوتێ. حەدیسە»

١٠. عام لـەگەڵ ئێمە یا ئێمە لـەگەڵ عام. «ئەبێ ئێمە لـەگەڵ عاما بین».

١١. عومرە گرانـمایەکەم سەرف کردووە هەر لـەمـا
چی بـخۆم لـە هاوینا، چی پۆشم وەختی سەرما
پـەشیـمانـم لـە کـارم، نـازانـم چیـە چـارم
بۆ کوێ بڕۆم بەم دەردۆ، بـۆ کێ ببەم هاوارم

١٢. عیشق و عەلاقە ئینسان زەلیل ئەکا، تو هەر خۆت زەلیلی لای خوا بکە.

١٣.عیشقیٚ کە مەجازی بیٚ تالّب مەبە ئیللا کچ لەیلا کچ و سەلما کچ و عوزرا کچ

«نالی»

«عیشقی مەجازی دوو شتی باشی تیایە: ١- بناغەی دامەزرانی بنەماڵەیە ٢- وەرزش و نەرمشە بۆ عیشقی حەقیقی».

١٤. عیلم و دین دوو باڵن بۆ ئینسان کە قودرەتی باڵ گرتنەوەی نیە، بەم دوو باڵە نەبیٚ و موسوڵمانیش بەم دوو باڵە کەماڵ پەیا ئەکا.

١٥. عوزر لە گوناح بەدترە. «کە نازانیٚ عوزریٚ بێنیتۆ».

١٦. عومری درێژ، ئەوەیە خراپە کە ئینسان مەرگی ئازیزی زۆر چاو پیٚ ئەکەویٚ.

١٧. عومری درێژ شەرمی لە کەس نیە.

١٨. عومرێکە شوانە هێشتا لوورەی گورگ ناناسیٚ.

١٩. عەتریٚ کە خۆی ئەنوێنیٚ، بە دەم تاریفی مەکە

تۆ کە ماڵت حەرامە چیتە لە دەوری مەکە؟

٢٠. عەجەلە مەکە لە کارا، عەجەلە کاری شەیتانە

شەیتان کە چاوی ڕاسی کوێرە لە بۆ نیشانە

٢١. عەزای دەوڵەمەن، شادی فەقیرە خەریکی چێشت و گۆشت و کەوگیرە

٢٢. عەفوو لە ئینتیقام باشترە. لەززەتیٚ لە عەفوا هەیە لە ئینتیقامدا نیە. «حەدیسە»

٢٣. عەفوو لە کاتی دەسەڵاتداری سەربەرزیە بۆ حوزووری باری

٢٤. عەقڵم نەماوە، فامم سەرسەری دڵەکەم باری کرد بۆ سەوداگەری

٢٥. عاقڵ دووجار ناخلەتیٚ.

٢٦. عەقڵ بە گەورەیی و بچووکی نیە، زۆر جوان هەیە لە پیر زۆر عاقڵ ترە.

٢٧. عەقڵ نەبیٚ گیان وا لە عەزابا. «فارس وایان وتووە: «گر عقل نباشد جان در عذاب است»

٢٨. عەقڵ و عیلم لە هەر کەسێکا کۆ بوونۆ، ئەو کەسە خۆشبەخت هەر دوو دونیایە.

٢٩. عەقڵ و کەماڵ لە تەڵاو زینەت و زیوەر باشترە.

٣٠. عەقڵ وەکو میوان وایە، بازێ وەخت وا لە جێداو بازێ وەخت نیە لە جێدا.

٣١. عەلامەتی بێ دەماری پیاو دوو شتە: ١- سواری کەر ٢- کۆمەك کردن بە خێزان و منالْ لە فەرمانی ناو ماڵا.

٣٢. عەلامەتی خۆشبەختی بەشەر ئەوەیە کە خواو خەڵکی لێ ڕازی بن.

٣٣. عەلامەتی دەس بەردار بوون خوا لە ئینسان ئەوەیە کە خەریك کارێ بێ کە قازانجی تیا نەبێ، نە بۆ دین و نە بۆ دونیا.

٣٤. عەمەڵ لەگەڵ ئیخلاسا تێکەڵ نەبێ ئیفلاسە

زووتریش هەروا بووە و ئیسەش بۆ خۆی هەر واسە

٣٥. عەوام بێ عـەقڵ و گەوج و ناتەواو　　　بە فڕێ کـۆن و بـە تـڕێ بـڵاو

٣٦. عەوامی و نەفامی دەردێکی گرانە، تـۆ خـۆنـەوارێـکی فـامیـدە بـە.

٣٧. عەیبی خۆت بێنی بۆ بەر چاوی خۆت　　　ئیتر عەیب لەکەس ناگری غەیر لە خـۆت

٣٨. عەیبی خۆت شۆرە بەدەسی چـەپت　　　بە دەس ڕاس خۆراك ببە بـۆ دەمـت

٣٩. عەیبی خۆت لە بەر چاوت لا مەبە　　　ئـیـتـر تـۆ نـاوی عەیـبی کەس مەبە

٤٠. عەیبی خۆت لەلای کەس مەڵێ، لەلای خوات تۆبەی لێ بکە.

٤١. عەیبی خۆت لەویا دۆزەرۆ کە ناوی عەیبی خەڵك ئەبەن.

٤٢. عـیبادەت تـەنیا خزمەت بە خەڵکە　　　تـەنیا تەزبێح و بەرماڵ بێ کەڵکە

٤٣. عیللەتی بێ بەرگییە کە هەتیو مەیلی هەتاو ئەکا

لە بۆ نانێ کە بیخوا هەمیشە چاوە ڕاو ئـەکا

٤٤. عیلم ئەوەیە کە لە دڵا بێ، ئەوە نیە لـە کاغـەزا نووسـرابێ و لـە گیـرفانا بـێ.

«ئیمامی غەزالی دوای تەواو کردنی خوێندن لە بەغدا، ڕۆیـشتۆ بـۆ وەتـەنی تـووس لـە ئێراندا، لە ڕێدا بوو بە ڕەفێق قافڵەیەك لە جەردە و ڕووتیان کردۆ، ئیمام غەزالی دەفتـەر یادداشتێکی پێ بوو بردیان، زۆر پاڕایەوە و نەیانداوە. ڕۆیشت بۆ لای سـەرۆکەکەیان و وتی: ئەم دەفتەرە موشکلاتی زۆرم تیا نووسیوە و کەڵکی بۆ ئێوە نیە، سـەرۆکەکە وتـی: ئەگەر تۆ زانا بوایی ئەوەی کە ئەتزانی لە ناو دڵتا دات ئەناو

ئێمە نەمانئەتوانی بیبەین. لە ئەنجاما بە منەتێك زۆر پێی دایەوە. ئەمە بوو بە دەرسێکی گەورە بۆ ئیمامی غەزالی و دوای ئەوە هەرچێکی ئەزانی ئەیخستە ناو دڵی و بە ئەو زانا چاکە دەرچوو. مەرحووم باوکم (مامۆستا مەلا باقری بالك، مەریوان) لە زۆر شتا بە تایبەت لە عیلما تەقلیدی ئیمامی غەزالی ئەکرد».

٤٥. عیلم و عیرفان و عەقڵ و کەماڵت باشترە لە کول سەروەت و ماڵت

٤٦. عیلم چوون درەخت عەمەڵ سەمەرەن عیلمی بێ عەمەڵ باخی بێ بەرەن
حەیفەن عومری وێت بدەی بە زایە چی دنیا بەرشی بێ ئایە و مایە
عیلم و عەمەڵ و عومرت بۆ زیاد عیلمی بێ عەمەڵ مەدەرە وە باد

«مەلا خدری ڕواری»

٤٧. عیلم هەتا بەشی خەڵکی زۆرتر لێ بدەی، زۆرتر ئەبێ و زەکاتی عیلم، فێر کردن خەڵکە.

٤٨. عیلمێ کە پێویست هەموو ئینسانە لە ناو عیلمانا تەنیا دووانە
پەروەرش بەدەن عیلمی ئەبدانە فێر بوون عیبادەت عیلمی ئەدیانە
هەر دوو عیلمەکە موحتاج پارێزن لە مونافییان خۆتان پاریزن

٤٩. عیلم هەرچەنێ زۆری بزانی کە عەمەڵ هاوڕێی نەبێ، نەزانی

«نامی»

***

# پیتی ‹غ›

## پەندی پێشینان

١. غەریب ئەو کەسە نیە وا لە شام و یەمەنا — غەریب تەنیا کەسێکە وا لە قەبرو کەفەنا

٢. غەریب ئەوە نیە لە دوور ولاتە — غەریب کەسێکە لە قەبرا ماتە

٣. غەریب ئانە نیا دوور بۆ جە وەتەن — غەریب ئانەنە بلۆ توی کەفەن

٤. غەریب غەریبەن، غەریب دیارەن — یاگەی غەریبان گۆشە و کەنارەن

٥. غیرەت نەماوە لە بەدەنما ئەونە ترسنۆك بووم.

٦. غەریب لە بەرۆ ددانی زەلە و لە دواوۆ قنگی.

٧. غەیبەت گوناحی کەبیرەس، مەیکە! — ئەگەریش کردوتە، زوو تۆبەی لیٚ کە

٨. غەیب زان تەنیا کەسێکە، ئەویش ناوی خوایە

لە زات و لە سیفاتا، لە ماسیوا جیایە

٩. غەیری تۆ کیٚ بیٚ کەمیٚ بڕوا دەمیٚ لەم ڕێگەوە

یانیٚ ئیزهاری کەلامی تاڵ و شیرین پێکەوە

تاڵ و شیرین پێکەوە نەمدیوە چا بیٚ، چا نەبیٚ

هەرکەسیٚ مەئنووسی سەرفی چا نەبیٚ، پێت چا نەبیٚ

«ناری»یە ئەم شێعرە وا بیٚ عەیب و بیٚ نوقسانیە

بۆ نموونە شاعیری وا ئەو نەبیٚ کەس وا نیە

***

# پیتی ‹ف›

## پەندی پێشینان

١. فاسقی خەمسە دیارە، دووپشك و مشك و مارە، قەلە بازەڵە و کولارە.

٢. فرتە و بانی شار. «واتە: ئەگەر زۆرم بۆ بێنن و زۆرم لەگەڵ بلێن، پەنێکتان پێ ئەدەم و ڕائەکەم بۆ جێیەیەك کە دەس ئێوەم پێ نەگات. بانی شار: زەمانی زوو دێیەك بووە لە شارەزووردا کە زۆرداری زۆری تیا بووە و ئەو زۆردارانە پەنا بوون بۆ پیاوکوژو جەردە و دزو درۆزن. ئەمە بۆیە وا مەشهوورە».

٣. فرسەت ئەوەمە نیە سەر خۆم خورێنم، ئەونە پڕکارم.

٤. فرسەت لە دەس مەدە.

٥. فرسەت وەسە شمشێر، تۆ ئەو لەت نەکەی، ئەو تۆ لەت ئەکا.

٦. فرە خۆر هەمیشە بار سکی ئەکێشێ.

٧. فرە وتن بۆ قورئان خوێندن باشە.

٨. فرەی مەکێشە با نەچڕێ.

٩. فرمان بۆ خۆت ئەکەی — منەت بەسەر کەسانە کەی

١٠. فەقێ هەشت و کەوچك نۆ — یەکیان خنکا بە بێ دۆ

«بە گشتیانۆ کەوچکێکیان بووە»

١١. فەقیر ئەوەیە ئەیبەنە قەساوخانە و سەری ئەبڕن وەکوو کاوڕ.

١٢. فیسقە خۆی چیە، تا هێلکەکەی بەچی بێ.

١٣. فیکەی خۆم ئەناسم، باریکە و درێژ.

١٤. فرە واردەی عەزاب، کاسە لێستەی سەوابا. «لە حەدیسەوە وەرگیراوە»

١٥. فەقیری خۆشە، قۆرتەکانی خراپن.

***

# پیتی <ق>

## پەندی پێشینان

١. قازانی مێردان بە چل ساڵ دێتە جۆش — کە هاتە جۆش دێر ئەبێ خامۆش

٢. قارچك و پیچك، سوورە بنە — دایکە بیخۆ کۆڵی منە

«کچانی کێوسان لە بەهاراندا وا ئەڵێن»

٣. قازانج سەرمایەی خوارد. «واتە: مایەی بە تەمای قازانج تیا چوو»

٤. قادرییە و سەرپەتی

٥. قاز لاسایی بازی کردۆ، بۆسێ قنگی دەرهات.

٦. قازی، تا یەکێکیان وا لە بەهەشتا، دوانیان وان لە جەهەننەما. «ئەویانە شەرعەکە ئەزانێ و حوکمی پێ ئەکا وا لە بەهەشتا، ئەویانە لە ڕووی نەزانیۆ حوکم ئەکا وا لە جەهەننەما، ئەویانە ئەیزانێت و بۆ تەماع لە شەرع لا ئەدا وا لە جەهەننەما».

٧. قالآو بە شۆردن و سابوون چەرموو نابێتۆ.

٨. قالآوێ ئەیویست فێری ڕەوتی کەو بێ، فێری ڕەوتی کەو نەبوو، ڕەوتی خۆیشی لەبیر چوو.

٩. قالبی ساقت بە سێ بەڕۆیی — عومری درێژت تا نیوە ڕۆیی

«بە تەمبەڵ وا ئەڵێن»

١٠. قامەتم زووتر وەك «ئەلف» وابوو — ئێستا وەك «نون»ە لەبەر هاتوچوو

هاتوچووی زۆرم کردووە بۆ دنیا — عومری عەزیزم واچوو لە بەینا

خۆزگا عومرەکەم چەن ڕۆژ ئەهاتۆ — جا شکات پیریم ئەکرد بە لاتۆ

خۆزگا جوانیەکەم ئەهاتە دواوە — شکاتی پیریم ئەکرد بەلاوە

لەوەی کە پیری هێنای بەسەرما — لیباسی شادی نەهێشت لەبەرما

١١. قاوەتوو و شێوت بکە بە تەرتیب — ئەو بەر نیوەڕۆ، ئەم لەپێش مەغریب

«نامی»

۱۲. قربۆق بە قیڕە گەورە نابێ، ئەرنا ئەبوا لە دونیادا جێیان نەبواییێتۆ.

۱۳. قسە بیجاوە جا بیکە، تا بیری لێ نەکەیتۆ، مەیکە.

۱٤. قسەیێ گۆشتی پێ ناگرم، بۆچی گۆشتی پێ کەم کەم
زوانی خۆم ئەبەسم و قسەی وا هەرگیز ناکەم

۱۵. قسە دەرچوو لە زارێ ئەگاتە تەواو شارێ

۱۶. قسە شەوچەرەی مالانە.

۱۷. قسە، قسە دەرێنێ، دووپشك، دووپشك دەرێنێ.

۱۸. قسە ناجاوێت، ئەیداتە دەرۆ هیچ خولکی ناکەن ئەچێتە بەرۆ

۱۹. قسەیەك کەوێتە سێ و دوو دیانە ئەکەوێتە سێ و دوو یانە

۲۰. قسەی موختەسەرو پڕمانا خۆشە کەم خواردن دەوای دەردی نەخۆشە

۲۱. قسە هیچی تێ ناچێ.

۲۲. قسە هەزارە و دووی بەکارە، ئەو دووانەش دوو کەلیمەی شەهادەتە.

۲۳. قسەی خولە ناوی بلەی لە بیر بردۆ. «خولە، لە ناو کوردەواریدا بە مەحموود ناو ئەلێن و بلە بە ئیبراهیم ناو».

۲٤. قسەیەك دوو نەفەر پێی ئەڕەنجێ مەیکە.

۲۵. قسەی ڕاس یا لە شێتی ببیسە یا لە منالێ.

۲٦. قسەیەك بکە کەلێك گرێ مەنێ پێوە سەر گرێ

۲۷. قسەیەکیش بکەین بۆ دز.

۲۸. قسەی هەژارە، هەموو کەس دەرەقەتی دێت کە هەر لە خۆیەوە تووڕی بداو ڕەفتاری پێ نەکات.

۲۹. قسەیێ لە دەروونی پاکۆ دەربێ، لە دلا جێی خۆی ئەکاتۆ.

۳۰. قشقەڕە، بێ تەماع پشت کەر ناخورێنێ. «ئەهلی ئەم زەمانە زۆری وەهانە».

۳۱. قلیان بکێشم یا خەجالەتی بە سەر بێم بۆ لات یا بەپێی پەتی

۳۲. قشقەڕە دۆمان، هەلپەڕە بۆمان.

۳۳. قلیان دەمی بەرەو ژوورە، هەر بۆی ئەگات و پەکی ناکەوێ.

٣٤. قلیچ موسوڵمان مەبە، هەموو دەستووری شەرع بەرێوە بە. «مووساییەك لە سلێمانی بوو کە زۆر عەلاقەی هاتوچووی خزمەتی حاجی کاکە ئەحمەدی بوو. وتیان، تۆ ئەونە حاجی کاکە ئەحمەدت خۆش ئەوێ، بۆ موسوڵمان نابی؟ وتی: موسوڵمانی ئەگەر وەکو حاجی کاکە ئەبێ، من پێم ناکرێ و ئەگەر وەکوو دزو حیزی ئەم ناو بازارە بێ با هەر مووسایی‌گەریەکەی خۆم بێ».

٣٥. قنگ ئەو شەقمە نیە وازم لێ بێنە.

٣٦. قنگ حیزی باشترە لە دەم حیزی.

٣٧. قورئان بخوێنە بە سەرما ئەمرم — بەڵکو لا ببات نەخۆشی و شەرمم

٣٨. قورئان کەلامی زاتی خودایە — قورئان رابەری دین و دونیایە

٣٩. قورئان دەوایە، قورئان شەفایە — قورئان خەڵاتی رەسوولی خوایە

٤٠. قومار باز لە بێ پووڵی‌یا تۆبە ئەکا.

٤١. قوربانی کوڕی سێو لە باخەڵ بم. «پیاوێ فێڵ باز پەڵەیێ گەنمی ئەبێ و گەلی چل نەفەری بۆ ئەکاو ئەترسێ درەوەکەی بۆ تەواو نەبێ. کچێکی زۆر جوانی ئەبێ و چل سێوی پێ ئەدا کە یەکە یەکە بە دزیەوە بیدا بە دەس درەوانەکانەوە، لە دواییدا باوکەکە پەسا پەسا ئەڵێ: بە قوربانی کوڕی سێو لە باخەڵ بم. بەوجۆرە ڕۆژ زۆر بەرز ئەبێ کە درەوەکە تەواو ئەبێ لە خۆشی سێوەکانا».

٤٢. قوڕ بە سەرم بۆ بیرم — چلۆن بیکەم تەکبیرم
کەوتوومە سەر ساج عەلی — نام چۆن بڕۆم لەگەلی

٤٣. قۆلانچە بۆی گوڵ ئەکا سەری یێشێ.

٤٤. قول ڕەش و سپی لە بوارا دەرئەکەوێ

٤٥. قومار باز کە داینا، نەڵێ بە گونمۆ، لە داخا ئەتەقێتۆ. «هەرچی لە دەس دەرچوو هەروایە».

٤٦. قووتم لێ قورمیش بووە، خوراکم بۆ ناخورێ
مەگەر شێ نەرمەقووت، وەك هەڵواو شووتی و ترێ

٤٧. قەبرم بۆ کەنن بە پاچ و زەنگەن — لە بەرزی بمنێن ڕووم کەن لە وەتەن

٤٨. قەبرم بۆ کـەنن لـە ڕێگـەی کـانی بەشـکم نـازداران پـا بنێنـە بـانی

٤٩. قەبرم لـە قەبری پیـرە ژن دوور بـێ با دڵـم گەش و پڕ لـە سـروور بـێ

٥٠. قەت خزمـەتکاری مەکـە لـە دنیـا نە بۆ ئەهلی دیـن نـە ئـەهلی دنیـا

ئەهلی دین دڵیان نابـەی بەڕێــوە بۆ دنیاش حەیفە بوەسـتی بـە پێـوە

«نامی»

هەموو کەس بۆ خۆی غەزالی بوایێ عـەوام و نــەفـام ئـەبوا نــەبـوایێ

چی بکەین بۆ سەپان، چی بکەین بۆ مزوور بۆ خەلە و حەیوان دەشتی شارەزوور

٥١. قەترەی ئاو هەمووی ئەگەر دوڕ بوایێ وەك موورو ئەبوا بـازاڕ پڕ بـوایێ

«جۆرە ماسی‌یەکی تووکن وا لـە بەحرا لـە وەختی بارانا پشتی لـە ناو بەحرا ڕووت ئەکات و قەترەی باران ئەچێتە ناو توکەکەی و تووکەکەی مەحکەم ئەدا بە یەکاو دوای بەینێ ئەو قەترە ئەبێ بە دوڕ».

٥٢. قەبر یا باخچەیەکە لـە باخچەکانی بەهەشت، یا بیرێکە لـە بیرەکانی جەهەننەم.

٥٣. قەدری زەڕ وا بەلای زەڕگەرۆ، نیە بەلای هەوڕگەرۆ.

٥٤. قەدیم وەجاخـان شـیوەنیان بڕیـاوە چـرای ناکـەسان تـا ڕۆژ گــڕیاوە

٥٥. قەرزکەی لە هەرکەس زەلیلی ئەوی ئەو ها لـە سەماو تۆ وای لــە زەوی

٥٦. قەرز بە دانەوەی نەبێ لە کۆڵ ناکەوێ بە سەد بەرتیل قەرزی لە کۆڵ ناکەوێ

٥٧. قەرز کردن چەنێ سـەهل و ئاسـانە ئەونـە دانـەوەی سـەخت و گرانـە

٥٨. قەرز مەکە لە دۆس و قەرزی پێ مـەدە جـار جـارێ نـەبێ سەری لـێ مەدە

«نامی» نووسیویە ئەم شیعرە جووانە بیگرینــە گوێمــان سەرمـایەمانــە

٥٩. قەرز کۆن ئەبێ و نافەوتێ.

٦٠. قەرزدار قەرزداری نەکوشتووە، وەلێ سەرچەنگی زۆری داوە.

٦١. قەرز دوو ماڵ ئاوەدان ئـەکاتۆ، مـاڵی قیامـەتی قەرزدەرەکـە و مـاڵی دنیـای قـەرز کەرەکە.

٦٢. قەرز کردن و نەدانەوەی، زۆر قەوم و کەسی کردووە بە دوژمن.

٦٣. قەرز کوێر مەبە و ئابڕوو و ئیعتبار خۆت مەبە.

٦٤. قەرزە سووتاو هەرجۆر دەست کەوێتۆ هەر باشە، ئەبێ شوکر بکەی.

٦٥. قەزا بۆ قیسپ ئەگەڕێ، «پیاوێ قیسپێ داویە لە پێی و هەڵیدڕیوە، ئەم پەندەی وتووە».

٦٦. قەزات لە من، لەوانە | بە شەو ئەچنە کولانە | بە ڕۆژ دێنە دەر یانە
قەزات لە من، لە خنە | لە جووتی گای بەر بنە | لە پیاوەکەی دوو ژنە
لەوانە دوژمن منە

«ژن لە کاتێکا منالی هەلپەڕاندووە ئەم شعرە پێشووەی وتووە».

٦٧. قەزا لە نیوەشا گەڕێتۆ هەر باشە.

٦٨. قەزای دۆسێ خاس کەوێ لە هەزار برای خراو.

٦٩. قەزای دەسم کەوێ لە چاوم. «پیاوێ چووە بۆ مازوو، تا ئێوارە گەڕاوە و مازووی چاو نەکردووە، ئێوارە هاتووەتۆو هەڵخزاوە و دوو مازوو کەوتووەتە مشتی، جا وتوویەتی: قەزای دەسم کەوێ لە چاوم».

٧٠. قەزای دیزە کەوت لە گۆزە | قەزای شەرمین کەوت لە بۆزە

٧١. قەفەس هەرچەنێ دەوری سیمینە | پەلەوەر تیا مات و خەمینە
بەرەڵای بکە چێ بۆ ئەو هەردە | چینە کا لە ناو ئەو دارو بەردە

٧٢. قەساسە قالە مەسە.

٧٣. قەل بە قەل ئەلێ: ڕووت ڕەش بێ.

٧٤. قەلەکە وتی: بەچکەم بوو بە دوو، تێرم نەخوارد لە وردەگوو. «ڕاستی وتووە، بەشەریش وایە بۆ خەمی منال».

٧٥. قەناعەت گەنجێکی بێ پایانە، خودا بە هەرکەس بیدا، سەربەرزی هەردوو دونیایە. «لە حەدیسەوە وەرگیراوە».

٧٦. قەناعەت ئینسان دەولەمەند ئەکا | سەربەرزو ڕوو سوور دوو دونیای ئەکا
دەس پێوە گرتن دەس بەرمەدە لێی | لە هەر دوو دونیا لەززەت ئەبەی لێی

٧٧. قەوم لە بەر چاو قەوما سووکە | ژن و ژن خوازیان هەر پووکە پووکە

٧٨. قەومان‌وخوێشان گرد یانەو ویشان | تەنیا دانیشتم خاتر پەرێشان

٧٩. قەومە یەك بگرن، یەك گرتن چاکە        قەومی یەك گرتوو شێری بێ باکە

«قانع»

٨٠. قەل هەڵفڕی، قشقەڕە لە جێیە.

٨١. قەولی وەسە بەولی. «بەول "بَول" وشەیەکی عەرەبییە بە مانا: گمیز».

٨٢. قەومان شەڕیان کرد، قەڵتەبانان بڕوایان کرد.

٨٣. قەوم بە قەومۆ ئەکاتۆ، بێگانە بە قلۆرە دارۆ.

٨٤. قەوم گۆشتەکەت بخوا، پێشەکەت ناشکێنێ، «لە بێگانە زۆر باشترە».

٨٥. قەومی خراپ وەسە گون قۆڕ، ئەیبڕی ئەمری، نایبڕی هەر ئەقۆڕێنێ بە دواتا.

٨٦. قەومی ژنان پا لە بەرە، قەومی شووان دەربەدەرە.

٨٧. قیاسی کەشك ئەکەی لە سەر مەشك، «کە هەر لە ناوا لەیەکۆ نزیکن».

٨٨. قێخای دێ بگرە و دێ بچاپێنە        هەرچی مەیلت هەس بیخۆو بیهێنە

٨٩. قێخا ڕازی کە و ناو دێی تالآن کە        سەیری لەرزانە و وردە خالآن کە

٩٠. قێخا ڕووس گیان مەکوشەما، زارۆلێما وردێنێ، جا هامێ هەنجیری موجیفییتا پەی ماروو. «نەفەرێك هەورامی، ڕووس ئەسیری کردووە و ئەمەی وتووە».

٩١. قیمەت و نرخی هەرکەسێ، گوفتارو ڕەفتاری خۆیەسی.

٩٢. قینم لەو خاوەن مالآنەیە کە خوراك چەند ڕۆژ لە یەك ڕۆژا سەرف ئەکەن.

«ئەبووبەکری سدیق ﷺ»

٩٣. «قل» بە «فل» حالی بووە. «هیچی لێ نازانێ»

***

# پیتی <ك>

## پەندی پێشینان

١. کابرایێ تووشی ڕێبوارێ بوو، وتی: ناوت چیە؟ وتی: ناوم محەممەدە، وتی: «صلّی الله علیه و سلّم»، وتی: من لەو موحەممەدانە نیم سەڵەواتیان لێ بدەی.

٢. کابرایەك کە فرەی ئەوت، پڕ مشتی زوانیان بڕی.

٣. کابرایەك وتی: ئەوانە شەڕیانە، یەکێ تر وتی: شەیتان ناوجیکەریانە. یەکێ تر وتی: ناخۆنە کرێ، شەڕ هەڵگرێ.

٤. کاخۆر جێی گەرمی بۆ چیە؟. «کەسێ بێ قازانج بێ، وای پێ ئەڵێن».

٥. کاربکە و مانوو بە بۆ ڕووسووری خۆت پەشیمان نابی لە کردەوەی خۆت

٦. کار گەورە بە بچووك مەسپێرە.

٧. کاردی لێ بدەن خوێنی دەرنایێ. «ئەوەندە غەزەب و قین لە دڵیایە».

٨. کار من ئەیکەم و بە ناو تۆوە تەواو ئەبێ.

٩. کار ئەوە کردی کە تەواوی کرد.

١٠. کار نیە خوا درووستی نەکا سابیر ئەوەیە کە هاوار نەکا

١١. کاروان بەرەو دوایە، مردنیش هەر وایە کە نۆبەی تیایە.

١٢. کاروانێ بە کەر خۆی ئەڵێ خاڵۆ بۆ ڕاسی کار خۆی ئەیکاتە ماڵۆ

١٣. کارێ بکەدوایخۆت ڕەحمەت وێژیت کەن نەك بڵێن ئۆخەی لەعنەت وێژیت کەن

١٤. کاری خوا برا بێ حیکمەت نیە با تۆش نەزانی حیکمەتی چیە

١٥. کێوسانان بەفرو بارانیان نەبێ دەجلە بە ساڵێ ئاوی وشك ئەبێ

ماشەڵڵا بارین چ نیعمەتێکە شوکرانەی لەسەر کول ئۆممەتێکە

خوا نیعمەتی خۆی نەگرێتۆ لێمان چوار فەسڵی ساڵێ نەشێوێ لێمان

١٦. کارێ مەکە خوات لێ بڕەنجێ.

١٧. کاریٚ بکەین نە سیٚخ بسووتیٚ نە کەباب. «میانەڕەو بین».

١٨. کارەکە خۆی کردوویەسی، بۆیە ئەونە بیٚ خەمە.

١٩. کاریٚکت پیٚ ئەکەم، «با» بە دەواری دۆمی سەید سایەقی نەکردبیٚ. «هەڕەشەیە»

٢٠. کاریٚك کە پەیوەندی بە تۆ نیە، خۆتی تیٚ هەڵمەقوڵتیٚنە، تۆ حەیوانت نیە شوان گرتنت لە چیە.

٢١. کاریگەر ئەوەڵ کەسیٚکە کە پیٚغەمبەرﷺ دەسی ماچ کردووە و ڕازی بووە بە کاری.

٢٢. کاریگەر پاڵەوان خوایە، گشت کەسی لیٚ ڕەزایە.

٢٣. کاریگەر حەبیب دەرگای خوایە     زوو هەروا بووە و ئیٚستاش هەروایە

٢٤. کاسب خۆشەویس خواس.

٢٥. کاریگەر، کریٚکەی بدەریٚ بەرلەوە ئارەقەکەی وشکۆ بیٚ. «حەدیسە»

٢٦. کاریٚ مەکە لەعنەتت لیٚ بکەن، لە سەر ڕیٚی خەڵکا پیسی مەکە.

٢٧. کاری نابەدڵ تەوقە لە گەردن     خەمی لاناچیٚ مەگەر بە مردن
ئارەق ئەڕیٚژیٚ و نان پەیا ئەکا     خیٚزان و میوان خۆی ڕەزا ئەکا

٢٨. کاسبی، دزی بە دەمۆ مەکە     خۆ بەلای خۆتو چووی بۆ مەکە

٢٩. کاسب حەبیبی خوایە، سەربەرز هەردوو دونیایە.

٣٠. کاسە تا پڕ نەبیٚ نارژیٚ، دڵیٚش تا پڕ نەبیٚ گریانی ناییٚ.

٣١. کاسە لە ئاش گەرمترە، بیٚگانە لە ساحیٚوکار خوێنگەرم ترە.

٣٢. کاسەی پڕ ئاشتی ماڵە     نەبیٚ ئەیکەن بە قاڵە
گەر ببیٚ بە جەواڵە     شەڕیان ئیتر مەحاڵە

٣٣. کاسەی کەیبانوو تەقەی نابیٚ.

٣٤. کاسەییٚ ماسم وا بە لاتۆ، پیٚم بەرۆ، دنیا دەسەوامە منیش وەك خەڵك وامە.

٣٥. کاکە ئەزانی حاڵم     ئیمرۆ ماڵ و مناڵم
نابن بە هۆی ئیقباڵم     سەبەبن بۆ زەواڵم

٣٦. کاکە دانیشتن ماڵ ویٚران ئەکا     بیٚکاری ئینسان پەریٚشان ئەکا
نەفرەت لە خۆی و لە ژیان ئەکا     لە میوانداری خۆی تەرخان ئەکا

نـان و مـافی تـۆ هـەر لـە کـارایـە  سەری بـێ ڕۆزی لـە ژێـر خاکـایە
بە پێی فەرموودەی ئـایەتی قـورئان  لـە سـەعی زیـاتـر نیـە بـۆ ئینسـان
هەوڵ و تێکۆشیـن فەرزە بۆ ژیان

٣٧. کـالاّ بـەقـەی بـالاّیـە  خـۆیـشی نیمچە بالاّیە
٣٨. کالاّ کێ دڕی ئەو کەس نەیپرسی.
٣٩. کاڵ کەنی مەکە با بێ کەڵك نەبی  با توورِ دراوی لای کـۆڵان نەبـی
٤٠. کردە پەشیمان، باشترە لە نەکردە پەشیمان.
٤١. کاڵەك بە ئەژنۆ ئەشکێنێ، ئەوەندە پەشیمان ئەبـێتۆ.
٤٢. کاهی بـخور، راهی برو. «فارسی‌یە و کورد ئەم پەندە زۆر ئەڵێن».
٤٣. کای کۆنە یاخوا ئاوری تـێ نەچـێ  پـیـر بـە پـیـری بۆ دڵداری نەچێ
٤٤. کچمان بەخێو کرد، کوڕی خەڵك بردی. کوڕمـان بـەخێو کـرد، کـچی خـەڵك بردی، ماوینۆ ئێمە بە هەناسە سەردی.
٤٥. کـچ ئەگـەر بـە منـداڵی سـواری بـانگلێنێکی بکـەن و دوو پـای بێتـۆ بـەدەور بانگلێنەکەدا، بێ خەم بیدە بە شوو.
٤٦. کـچ تـا دابـنیشێ بەخت هەڵئـەنێتۆ  شووی باشتر ئـەکـا باش ئەحەسێتۆ
٤٧. کراسێ بە پیسی بیدڕی، بە سەد ئاو پاکی نایێ.
٤٨. کچێ کە دایکی تاریفی بکات، مەگەر خاڵۆی بیخوازێ بۆ کەسێکی خۆی.
٤٩. کراس تا کۆن بێ ئـاڵـۆشی زۆرترە  پیریش بیانوگرترو تەمای دنیای زۆرترە
٥٠. کردوویەتە سەر دارێ بەرزو بۆم نایەتە خوارەوە.
٥١. کردەی تۆیە، بردەی شەیتان. «واتە: ماڵەکەت کەم بەرەکەتە و کەس نیە ماڵت بۆ کۆ بکاتەوە».
٥٢. کرێ نشینی و خۆش نشینی منەت و شاباشی کەسی تیا نیە.
٥٣. کـشـە کـشـە پـۆپـە ڕەشـە  میوان شـەوێ، دووان خۆشە
«بازێ میوان بەو جۆرە جواب ئەکەن. ژنێك بە میوانی وا وتووە و میوانەکـەش جـووابی

داوەتۆ:

کشە کشە پۆپە لارە    میوان جێگەی تا بەهارە

٥٤. کلاش خەلکە و مانگە شەو، هەروا ئەچم تەقلە دەو، هەتا نزیك نیوە شەو.

٥٥. کلاو ئەنێتە سەر شەیتان. «ئەونە تەلەکە بازە».

٥٦. کلاوم لە پۆپەوە دڕاوە. «واتە: بێ ڕیا و تەزویرم».

٥٧. کلکی پیا هەلئەسپێرم.

٥٨. کۆ بە کۆ ناگا، ئینسان بە ئینسان ئەگا. «کۆ ناو کۆمەلە هەسێرەیەکە کە نۆ دانەن و لە ئەوەلی بەیانی ئەوەڵ مانگی هاوینا دەرئەکەون. ئیتر کاتی ئالف کەندنی گیای کێوسانە لە قەبیلی کەماو لۆو پێی دەلێن: کۆکەن».

٥٩. کوتەك بەی لە ڕەفیقم، وا ئەزانم لە ڕەشکەکای ئەدەی.

٦٠. کوتەك لە بەهەشتۆ هاتووە، زۆر کاری ڕێ خستووە.

ئۆخەی کوتەك گیان وا ئەونە باشی    دێنیتە سەر ڕێ ئوستادو ناشی

٦١. کۆتەی دار قەسوان بە ئاو نابێ جوان. «بە ناشیرین وایان ئەوت»

٦٢. کۆتەی دارقەسوان هەلگرن بۆ هەرمێ پشتوکان.

٦٣. کوڕ ئازا مالی بۆ چیە، نەیشیێ پەیای ئەکا. کوڕ حیز مالی بۆ چیە، بیشیێ بە ڕیای ئەکا.

٦٤. کورد بیدوێنی، خۆی شەرعی خۆی ئەکا. «واتە: زۆر بە ئینسافە»

٦٥. کوردە بازاڕە، کورد نەچێتە بازاڕ، بازاڕ وێران ئەبێ. «یان: بازاڕ ئەگەنێ»

٦٦. کوردە یەك بگرن، یەك گرتن چاکە    قەومی یەك گرتوو شێری بێ باکە

٦٧. کوردە، یەکێکیان پێ نەئەدا داوای دوانی ئەکرد.

٦٨. کوردێك و گۆرانێك شەڕیانە لەسەر ماڵ موسولمانێك.

٦٩. کوڕێ پرسی لە باوکی: باوە چەنێ زستانمان ماوە؟ وتی: ڕۆلە شەوو ڕۆژێکمان ماوە. وتی: باوە یا بەش شەوەکەی ئەکەین یا بەش ڕۆژەکەی. شەو هەلسان بەفری زۆر باری بوو، کوڕەکە وتی: باوە نەموت!.

٧٠. کۆسە کۆسە و کەس لە کەسە. «واتە: کەس لە ڕێی کەس ناوێسێ»

٧١. کۆگایان وەسە کۆگای گزگل، هەر کۆ نابێتەوە.

٧٢. کۆلارە، جووجکە مەبە بەهارە، بۆ شێخەکان نزارە. «من منالْ بووم کۆلارە ئەهات بۆ دەوری دێ و جووجکەی ئەبردو ئەیخوارد. منالآن هاواریان لێ ئەکرد کە نەیبات و نەیخوات».

٧٣. کولْك و موو شی مەکەرۆ، زامی زووم بیر مەخەرۆ.

٧٤. کولە ترِی، بەش خۆی برِی. «کەسێ ئازاری بێ بۆ خەلْك، وای پێ ئەلْێن».

٧٥. کۆمەك بکە برای دینیت، زالْم بێ یا مەزلْووم. زالْم بێ مەیێلە زولْم کا، مەزلْووم بێ مەیێلە زولْمی لێ کەن. «حەدیسە»

٧٦. کونە مشکی لێ بووە بە قەیسەری ئەونە کەوتووەتە ناو دەردی سەری

٧٧. کوێت هەر جۆر بێت. «جامی وتوویەتی: ماینی کوێت هەرجۆر بێت بۆ بەخێو کردن زۆر باشە و بە خێرە».

٧٨. کوێر بۆ کێر خۆی حەساب باش ئەگرێتۆ گرێی دلْی بەمە زۆر باش ئەکرێتۆ

٧٩. کوێرە کانیەکان بە کانی مەکە تازە پیا کەوتووە قەرزی لێ مەکە

٨٠. کوێر هەرتا ئەمرێ بە تەمای چاوە بۆ بازێ ئەمە خەیالْ پلآوە

٨١. کوێرە چیت ئەوێ؟ دوو چاوی ساق.

٨٢. کە پیاوێك ئەبینم بێکارەیە، لەبەر چاوم ئەکەوێ. «کە تۆ هەمیشە ئیحتیاجت بە خواردن هەیە، بێ وچان ئەبێ هەولْی بۆ بدەی. ئەبوبەکری سددیقﷺ»

٨٣. کەچەلْ بە بەختە، ژنەکەی جوانە ئەمە تەجرەبەی هەموو دەورانە
یا تۆیش کەچەلْ بە، یا کەچەلْ بەخت بە یاتۆیش وەك بازێ نەحسو بەدبەخت بە

٨٤. کەچەلْ پیاوی ئەم مەیدانە نیە.

٨٥. کەچەلْ تیمارکەر بوایێ، تیمار سەرخۆی ئەکرد.

٨٦. کەچەلْ شەمامەی باخەلْ.

٨٧. کەچەلْ هەر ئەونەی زەحمەتە کە کلآوەکەی داکەوێ.

٨٨. کە خالْی بێ دلْی عالم لە عیرفان لە ئەعمالآ نەبێ حوسنی نمایان
عەمامە و مێزەرە و دەسمالْی رووسی وەکوو شەمعە لە سەر قەبری مەجووسی

٨٩. کەر بە پەیغام-ئاو ناخواتۆ     بە هەوسار بیبە جا ئاو ئەخواتۆ

«ناری»

٩٠. کەر بەستە و خاوەن ڕەستە.

٩١. کەر بە کاروانی تێر ناخوا، لە ماڵۆ تێری بکە.

٩٢. کەر بە لێدان نابێ بە ئەسپ.

٩٣. کەر چووە بەغدا بوو بە هێسر. «ئەمە مەلای مەزبوورە وتوویەتی»

٩٤. کەر چیەسی بەسەر نوقڵ و نەباتۆ     هەر کاو جۆ ئەخواو هەر هەڵئەخاتۆ

٩٥. کەر دێز تا نیوەڕۆ لەسەر زەرەر خۆیەسی     نیوەڕۆ دوا لە سەر زەرەر ساحێبەکەیەسی

٩٦. کەر کۆپانەکەی نوقرە و تەلا بێ     خواردنی برنج لە جیاتی کا بێ

فیردەوسی بێنی و بێ بە مەیتەری     قەد تەرکی ناکا ڕەوشتی کەری

٩٧. کەرگەیشت بە کەر، تەمەرێز هەی تەمەرێز     لەویا مەوێسە دەسکە بە گورێز

٩٨. کەر بێنە و ئەم ترۆییە بار کە.

٩٩. کەر دێز حەز ئەکا بە تۆپین خۆی، چونکا زەرەر ساحێوەکەی وا تیا.

١٠٠. کەر زۆرە کەچی من داماوم بۆ بارە بەری.

١٠١. کەر فەقیرە هەر بارێکی لێ بنێی ئەیبا، وەلێ بەشەر ئەبێ ڕەحمی بێ و باری گرانی لێ نەنێ.

١٠٢. کەر کوڵ و بار سووك. «واتە: تا بەشەر عەلاقاتی دنیای کەمترە، ئاسوودەترە».

١٠٣. کەر کە سەرِانی، گورگ بۆ خۆی پەیدا ئەکات.

١٠٤. کەر کە هەشتی برد، نۆیش ئەبات.

١٠٥. کەرە و سیراجیش لە وەخت خۆیا خۆشە.

١٠٦. کەروێشك بەرەو ڕووی ڕێبوار بێ، نەگبەتییە. ڕێوی ئێقباڵە. «بۆیە ئەڵێن: ڕێوی هاتووە بە پیریتۆ، ئەم کارە باشە بیکە».

١٠٧. کەروێشك ترسنۆکە. هەر چاوێکی ئەخەوێ و ئەوی تریان قەرەوڵی بۆ ئەدا بە نۆرە.

١٠٨. کەروێشك وتوویەتی: کەیبانوو دزی لە گۆشتەکەم نەکا، وەردی زەماوەنی ئەدەمۆ. «واتە: ئەوەندە بە بەرەکەتم».

١٠٩. کەروێشك و کەمتیار، ساڵێ نێرن و ساڵێ مێچکەن، هەر دوو ئالەتەکەیان هەیە و هەر ساڵێ
یەکێکیان ئەخەنە کار. «ڕاوچی ئەمە باشتر ئەزانێ».

١١٠. کەروێشك و کەمتیارو شەمشەمە کوێرە و سەگ و وشترو قربۆق، وەکوو ژن حەیزیان هەیە. کتێبی «حیاه الحیوان» ئەمەی نووسیوە.

١١١. کەرەکەم شەلە و بڕ نـاکا ژنەکەم پیـرە و سك ناکا

«گەمەی منالآنەیە. واتە: دەسەلآتـم نیە»

١١٢. کەرەکە مەمرە بەهارە، چووزەی کەما دیارە.

١١٣. کەرەکەیشم پێ ئەگێت و شایەتیمانیشم پێ دێنێ.

١١٤. کەرە لە کوێ کەوتووی، کونە لە کوێ دڕاوی. «ئەم لە کوێ و ئەو لە کوێ»

١١٥. کەرەم کەر، کەرەم بکە لەگـەڵما ئیتـر سەرشـۆڕی نـەیێ بـە سـەرما
بە پیـری ژنــی جـوان نــەهێنم خەجاڵەت بـە سـەر خۆمـا نـەهێنم

١١٦. کەر هەموو ساڵێ بچێ بـۆ مەکـە کە هاتۆ کـەرە، سڵــی لــێ مەکـە
ئیشارەی شیعری سـەعدییە ئەمـە مۆجگاری چاکە، مەیکـە بـە گەمـە

١١٧. کەری پیرو هـەوســار نــۆ سەرە ســـەرِیــە لە دەور جـۆ

١١٨. کەری خۆمم لێ بووە بە ڕمووزن.

١١٩. کەرێ بە جۆ بتۆپێ، خۆی بە شەهید ئەزانێ.

١٢٠. کەر هەر ئەو کەرەسە، کۆپانەکەی گۆڕاوە.

١٢١. کەری خۆمە و گوێی ناڵ ئەکەم. «بە تۆ چی!».

١٢٢. کەری خۆی لە پرد پەڕاندووەتۆ. «واتە: خەمی کەسی نیە».

١٢٣. کەرێکم بەنێ با ئالف بێنم بۆ کەرەکانم. «کابرایـەك حـەوت کـەری بـوو و بـار بەرێکی نەبوو، ئەڕۆیی و لەماڵان کەری ئەخواست و ئەیوت: کەرێکم بەنێ با ئالف بێنم بۆ کەرەکانم».

١٢٤. کە ژنت هێنا خۆت لادە لە خەم کـچ بێنە کە کـچ ڕازیە بە کەم

«حەدیسە»

۱۲۵. کەس بە خەیاڵ نابێ بە ماڵ		بە واتەو تیە ناگا بە کەماڵ

۱۲۵. کەس بە قسە تێر ناخوا.

۱۲۶. کەس پیشە و پلانی باوکی نەناوەسە کۆڵی. هەرکەس ئەبێ کوڕی هونەری خۆی بێ. «ئیشارەی ئایەتە»

۱۲۷. کەس حەز ناکا هیچ کەس لە خۆی باشتر بێ. «بێجگە لە باوك و دایك کە زۆر حەز ئەکەن ئەولادیان لە خۆیان باشترو زاناترو ناودارتر بێ».

۱۲۸. «کەسرا» کە پادشای ئێران بووە، ڕۆژگاری خۆی بەمجۆرە ئەکرد بە چوار بەش و ئەیوت: ڕۆژی «با» بۆ خەو باشە، ڕۆژی «هەور» بۆ نەچیر، ڕۆژی «باران» بۆ گەمە و خواردن، ڕۆژی «خۆرەتاو» بۆ کارو کاسبی.

«پێغەمبەری خۆمانﷺ شەوو ڕۆژی خۆی ئەکرد بە سێ بەش: بەشێکی بۆ عیبادەتی خوا، دووەمی بۆ خزمەت ماڵ و منالی، سێهەمی بۆ کارو شتی خۆی. لەم بەشی خۆیا خزمەتی دینی و دنیایی بە خەڵك ئەکردو مۆجگاری خێری ئەکردن».

۱۲۹. کەس سەرخۆی ناتاشێ. «واتە: هەموومان نیازمان بە یەکتر ئەکەوێ و بێ یەکتر ناژین».

۱۳۰. کەس کەس ناناسێ تا تەما نەکەوێتە بەینۆ.

۱۳۱. کەس لە پرێ نەبووە بە کوڕێ		حەوسەڵەی زۆرو کۆششی ئەوێ

۱۳۲. کەس لەکردەی خۆی پەشیمان نابێ		بەردەوام هەرگیز بێ بەهرە نابێ

۱۳۳. کەس نابێ بە ناکەس و ناکەس نابێ بە کەس.

۱۳۴. کەس لە کەس و تێکە و لێکەیە. «دنیا بێ ساحێب و هەریەك بۆ خۆیەتی».

۱۳۵. کەس منی نەخڵەتاندووە ئەو کەسە نەبێ کە وتوویەتی: تو خۆت وەکیلی من بە.

۱۳۶. کەس و کار مردووی خۆیان بشۆرن باشترە لەوە کە بینێنە بەردەس بێگانە. «حەدیسە. بۆیە حەزرەت عەلیﷺ پێغەمبەری شۆرد کە خەزوورە و ئامۆزای بوو».

۱۳۷. کەسێ بچێتە ناو گۆڕ بێ تۆشە، وەسە کەسێ کە بچێتە ناو دەریا بێ کەشتی. «حەزرەتی ئەبووبەکرﷺ»

۱۳۸. کەسێ بە تەمای سەفەرالی بێ		هەمیشە برسیو دەسی خالی بێ

۱۳۹. کەسێ بیر کەنێ خەڵکی تێ کەوێ		بەر لە هەموو کەس خۆی تێ ئەکەوێ
«ئۆخەی!»

۱٤۰. کەسێ تاریف خۆی بکا، زەکات گەوجی خۆی دەرئەکا.

۱٤۱. کەسێ دوو ڕوو بێ، هەر دوو ڕووەکەی ڕەشە لە هەر دوو دنیادا.

۱٤۲. کەسێ دەرس بە تێنەگەیشتوو بڵێ، بە ناحەق خۆی ماندو ئەکا.

۱٤۳. کەسێ دەعوەت خەڵك بکات بۆ خێر، لە خێر ئەوانا شەریکە. «حەدیسە»

۱٤٤. کەسێ دەم بنێتە دەم بێ حەیا، ئابڕووی خۆی ئەبا.

۱٤٥. کەسێ شتێکی بەخشیوە، بیسێنێتۆ، وەسە سەگێك ئەوەی هەڵیهانیوەتۆ بیخواتۆ. «حەدیسە».

۱٤٦. کەسێ شەڕ کا بە خوێنی خۆی بازی ئەکا.

۱٤۷. کەسێ کە تەگبیری پێ کراوە و بە ئەمین دانراوە، نابێ خەیانەت بکا. «حەدیسە»

۱٤۸. کەسێ کە ڕەحم بە خەڵك نەکا، خوای گەورە ڕەحمی پێ ناکا. «حەدیسە»

۱٤۹. کەسێ کەسێکی گابێ		ئاخۆ لە بیری مابێ
بڕوای پێ نەکا هەتاکوو ماوە		ئەگەر ڕاس ئەکا لە بیری ماوە

۱٥۰. کەسێ کە قسە بکات و گوێی لێ نەگرن، پێی ئەڵێن بڵۆ وڕ. «تۆ وا مەبە»

۱٥۱. کەسێ کە قسەمان بۆ ئەکا یا ئامێرە و دەستوور ئەدا یا مەئموورە و دەستوور بەجێ دێنێ، یا ڕیا کارە.

۱٥۲. کەسێ کە قورئان خوێن بێت و ڕەفتاری پێ نەکا، وەسە کەرێ کە بارت نابێتە سەرشانی و ماندوویی نەبێ، هیچی لێ حاڵی نابێ. «ئیشارەی قورئانە».

۱٥۳. کەسێ کە موسڵمانان لە دەس و زوانی ئەمین نەبن موسڵمان نیە. «حەدیسە»

۱٥٤. کەسێ گیانی تیا بێ، نانی بەنێ و لە ئیمانی مەپرسن. «لەبەر ئەوەی کەسێك وا گیانی شیرین و نانی پێ داوە نەپیرسیوە. شیخ ابوالحسن خرقانی»

۱٥٥. کەسێ لە زیندوویی خراپەی نەکردبێ، لە قەبر ناترسێ و ئەسرەوێ.

۱٥٦. کەس لە سەر بەرەی کەس دانەنیشێ باشە، بەرەی خەڵکی قنگ هەڵئەتەکێنێ.

۱٥۷. کەسێ لە شەڕا ڕا بکات، بە خوێنی لەشکرەکەی بازی ئەکا.

١٥٨. کەسێ لەم دنیا بێ زەحمەت ناژی — زەحمەت نەکێشی قەرانێ ناژی

١٥٩. کەسێ لێم پرسێ ئەم دنیا چۆنە — ئەڵێم ئەم دنیا پیرە ژنی کۆنە

چەن شووی کردووە و هیشتا هەرکچە — کەس شاد نەبووە بەم پیرە کچە

١٦٠. کەسێ لە منداڵیدا فێری هەر زانینێ نەبێ لە پیریدا فێر نابێت و نابێ بە وەستا کار. «حەزرەت عەلیؓ».

١٦١. کەسێ نەخۆشین داری بوو و کەس پەرەستاری نەبوو، ئەبێتە هۆی عوزری و ئەگەر بۆ جەماعەتیش نەڕۆیشت بۆ مزگەوت، گوناحی نیە.

١٦٢. کەشکیش برای دۆیە، هەر دوویان هەر بۆ تۆیە.

١٦٣. کەعبە کەج نابێ، تاوێ بێ بۆ لام، لات بە دەوار بێ کە نایێت بۆ لام.

١٦٤. کەڵەشێر لە ناوەختا بخوێنێ خوێنی خۆی حەڵاڵ ئەکا. «لە ناوەخت کەسێ بانگ بلێ شەریعەت تەعزیری ئەکا».

١٦٥. کەڵك لە کەڵك ئاوسە. ئەبێ دەسەوام بدرێتۆ.

١٦٦. کەڵەشێر برسی، خەو بە خەرمانی ئاوبردووێ ئەبینێ.

١٦٧. کەڵەشێر چاوی بە مەلائیکە ئەکەوێ، ئەخوێنێ. کەر چاوی بە شەیاتین ئەکەوێ ئەسەڕێنێ. «حەدیسە».

١٦٨. کەڵەشێریش نەخوێنێ ڕۆژ هەر ئەبێتۆ — مەینەت دوبارە دەس پێ ئەکرێتۆ

١٦٩. کە من باخی مورادم بێ سەمەر بێ — بە من چی باخی عالەم پڕ سەمەر بێ

١٧٠. کەم بخۆو مەڕۆ بۆ لای دوکتۆر.

١٧١. کەما بۆ کەر ئەکەنن کە کەر تۆپی کەمای ناوێ

بە زیندوویی بۆی ببەن کە تۆپی بەکار نایێ

١٧٢. کەم بخۆو کز دانیشە، قەناعەت بکە بە پیشە، ئەمەتە باشە هەمیشە.

١٧٣. کەم بژی و کەڵ بژی. «واتە: با ژیانیشت کەم بێ بەڵام ئازادانە بژی».

١٧٤. کەمتر قەرز بکەن با ئازاد بن و ئەسیری کەس نەبن.

١٧٥. کەمتیار مەردێکی چاکە، قولی ئەسمن دەنگ ناکا. بەوجۆرە لە کون دەری ئەکەن.

١٧٦. کەم خۆرو هەمیشە خۆر بە.

١٧٧. کەمم تیّ بنیّ و بمجاوە لەززەتم وا لە دواوە

«تیکە وایە وتووە»

١٧٨. کە من پیّ گەیشتم، تۆ حەسایتۆ. «باوکی پیر بە تەشەرۆ بە کوڕەکەی وتووە. کوڕەکەیشی وتوویەتی: باوە تۆ قالّب سووك تری بۆیە قالّ بووی بۆ کار».

١٧٩. کەمی بە بەرەکەت باشترە لە زۆری بیّ بەرەکەت. «کەم بیّ و بە کەرەم بیّ».

١٨٠. کورد هەرگیز ناگا بە مەقسەد نۆکەری بیّگانەیە

دوو دلّ و پیسن لە ناو یەك بۆیە وا بیّ لانەیە

«مامۆستا قانع»

١٨١. کەنعان کوڕی حەزرەتی نوح﷤ بوو کە لە ئیمان و عەمەلّی سالّحا لەگەلّ باوکیا نەبوو، لەگەلّ دایکی و ڕەفیّقە کافرەکانیا لە تۆفانەکەدا خنکا. بەلاّم سەگی ئەسحابی کەهف چوون ڕەفیّقی پیاو باشی کرد لە ڕیزی ئەواندا ژیاو مرد. «ئیّمەش هۆشمان بە خۆمانەوە بیّ با تووش نەبین».

١٨٢. کەو ئەوەیە لە بەرانبەر کەودا بخویّنیّ نەك بە نەخشینی هەر خۆی بنویّنی

١٨٣. کەوا سوور بەر هوردوو مەبە، بیّ ڕەویە مەکەوە بەر کەسۆ.

١٨٤. کەوا نان بخۆ: «کابرایەك بە میوانی ڕۆیشت بۆ مالّیّ بە ڕووتەلّی، نانیان پیّ نەداو حورمەتیان نەگرت، ڕۆیشت و سەرتاپا جلی جوانی پۆشی و ئەمجارە ئیّحتیرامی زۆریان لیّ گرت و میوانی چاکیان کرد. ئەویش وتی: کەوا نان بخۆ».

١٨٥. کەوتۆتە سەر ساجی عەلی. «واتە: هیچی بەدەسۆ نەماوە. بۆیە وا خەمی زۆرە و وەها بیّ نان و ئاوە».

١٨٦. کەوتووەتە سەری هەوای یاری نۆ یا بۆ «وەیس» ئەچیّ یا بۆ «باینچۆ»

«وەیس کە هەمووتان ئەیناسن و ئەزانن کە پیاویّکی گەورەیەو مەرقەدی پاکی لە بەین کرماشان و ڕەوانسەرە. باینچۆ: دیّیکە لەبەر پلەی سارالّ کە وەختی خۆی پیاو چاکی زۆری لیّ بووە و هەموویان سەییدن. ژن و پیاو هەستی بیّ مەیلی لەیەك بکەن، بە یەکتر

وا ئەلێن».

١٨٧. کەوش و جلی ڕەش، موسیبەتە و دەرد — بۆ لابردن خەم، باشە کەوشی زەرد

١٨٨. کە هەڵمەت بێنێ بۆ تۆ تیر بە هێزی قەزا

هیچ چارەسەرت ناکا مەگەر تەسلیمو ڕەزا

١٨٩. کەی ئاخۆ کاکە دەسمان چەور ئەکەی؟

بۆ زەماوەتت دەعوەتمان ئەکەی؟

١٩٠. کێ پلاوی خواردووە؟ ئەوە بچێ بۆ لای بووك. «ئەمە زاوایەك وتوویەتی کە چێشت بەشی نەماوە».

١٩١. کێچێکی حەو مەن شیر ئەدات. «ئەونە چەقاوەسووە».

١٩٢. کێچێ میوانی نیە. «ئەونە بێ خەمە».

١٩٣. کیسەڵ تۆ بازت کوا تا گازت بێ.

١٩٤. کیسەڵ کاروانی کردووە. «کەسێ سکاڵا بە دەس کارۆ بکات، وای پێ ئەڵێن».

١٩٥. کیمیاگەر ئەگەر مردبێ بە ڕەنج — بێ ئاگاو بێ ڕەنج دەسی ئەکەوێ گەنج

١٩٦. کێوسانان خاڵ خاڵ بەفری ناچێتۆ — قیبلەم تۆراوە و ئاشتی نابێتۆ

ڕیش دەم و چاوم سپی بووەتۆ — تازە سپیەتی هەر لێ نابێتۆ

جوانیم تۆراوە و ئاشتی نابێتۆ

١٩٧. کەم بوو، چی؟ هاتی بۆ فرە؟.

١٩٨. کەماڵی ئینسان بە ئەدەب و زانینە. کەسێ تا ئەم دوانەیە زۆرتر بێ کەماڵی زۆرترە.

***

# پیتی <گ>

## پەندی پێشینان

١. گاڵ ئەخۆیت و هێلکە ناکەیت، سەرت ئەبڕم ئەوە دەردت بێ. «پیاوێك بە مریشکەکەی ئەمەیە وتووە».

٢. گا بە تەنیا جووت ناکا. «بۆیە وتوویانە جووت، کە هەمیشە جووت بن».

٣. گا بە دەم جووتیارا ئەڕوانێ، ژێردەسیش بە دەم گەورەیا.

٤. گا بە دەنگم ناڕواو کەس بە گوێم ناکا.

٥. گا بە گونا ئەناسێ. «ئەوەندە تێگەیشتنی کەمە».

٦. گا گا بە خەروار ئەنێرێ بۆمان — گا گا بە مسقاڵ بەشیەکا بۆمان

٧. گامان گرووە، هەر کلکی ماوە — ناجۆری کارمان نەختێکی ماوە

٨. گا گا بە خەروار، گا گا بە مسقاڵ.

٩. گام وا بە بارۆ، دۆینەم وا بە دارۆ، زووکە مەلا ئەم کوڕمە بۆ بکە بە مەلا. «جافێ وای وتوە»

١٠. گا وێڵ ئەکا، گوێرەکە بە خێو ئەکا.

١١. گای جووتی زیادە خزمەتی ئەوێ. زەحمەتی زۆری لە سەر شانە. «ژنێ وتوویەتی بە منالەکانی: بۆیە زیادە خزمەتی باوکتان ئەکەم، ئێوە گلەیی مەکەن. ڕاسی وتووە مەنعی مەکەن».

١٢. گرفتارێ ئەبینی گەمە و گاڵتەی پێ مەکە
گوناهی زۆر گەورەیە چاولێگەری کەس مەکە

١٣. گشت ئەم پەنجانە وەکوو یەك نین. گەورە و بچووك، لە «قالوا بلی» وە هەر وابووە.

١٤. گشتمان هەولّ بدەین کە حەق دەرکەویّ
دوای ئەوە هەولّ بەین کە حەق سەرکەویّ

١٥. گلّ کەوە کەوتووەتە بەینمان، بۆیە لەیەك تۆراوین.

١٦. گلّ مەیل بڕە، بۆیە زۆرترین خۆشەویست ئەمریّ، کەس و کاری کەم کەم مەیلی کەم ئەکەن.

١٧. گلۆلّەم کەوتووەتە لێژی، بۆیە خاسم نایێژی.

١٨. گلۆلّەیە بەن با دە، خۆت لە بیّ حەیا لادە.

١٩. گورگانە شەویّی بۆ ئەکا. «واتە: ئەیخلّەتێنیّ. لەمەو پێش بە شەوا منالّ یا لە برسا یا لە ترسا یا لە سەرماو گەرمادا خەوی لیّ ئەشێواو سەرگەرمی‌یەکیان نەبوو کە ئارامی کەنۆ. دایکی گورگانەشەویّی بۆ ئەکردو ئەیگوت: گورگانە شەویّ، گورگانە شەویّ، گورگەکە لە مالّمان دوور کەویّ، چیت بۆ مالّ حەسەن هاوسێمان، حەسەن بخواو ڕابێی ژنی بخواو ڕەحیم بخواو ڕەحمان بخواو ئامە بخواو تامە هەلّگریّ بۆ تۆشەی. بەم جۆرە یەکە یەکە منالّەکان و هاوسێکانی ئەدا بە دەم گورگەکەوە تا منالّەکەی خەوی لیّ کەویّ. لەم زەمانیشا بە زۆرکەس کە فیلّ بازن و فریوی خەلّك ئەدەن، ئەلّێن گورگانە شەویّی بۆ ئەکا».

٢٠. گورگ بچێتە ناو ڕان، لە دوورۆ دەم ئەکاتۆو ئیتر دەمی بۆ ناکرێتۆ لە خۆشی‌یا.

٢١. گورگ چووزانیّ جووتیّ شەك چەنیّ ئەکا، بۆیە دەسی تیّ ئەچیّ بیخوا.

٢٢. گورگ کە بە شەوا ئەخەویّ، سەری ئەنێتە سەر دوو چەپۆلّەی، چونکە متمانەی بە ڕەفیقەکانی نیە و لەبەر خەیانەت باری خۆی هەمیشە ئامادە باشە. «زالّمیش هەر وایە».

٢٣. گورگ کە پیر بوو، ئەبیّ بە گەمە جاڕ سەگ.

٢٤. گورگ کە شوان ڕان بێت، ئەبێت ڕانەکە حالّی چۆن بێت.

٢٥. گورگ و مێش بە یەکۆ ئاو ئەخۆنۆ. «واتە: ئەوەندە حاکمەکەمان عادلّە».

٢٦. گورگ هەرکامیان بریندار بوون، ئەوانی تریان گەلە کۆمەی لیّ ئەکەن تا ئەیخۆن. «ئەهلی ئەم زەمانە بۆ کزۆلّە هەروانە».

٢٧. گورگی وەتەن گۆشتەکەت بخوات، پێشەکەت ناشکێنیّ. هەر لە بێگانە باشترە.

٢٨. گرێیە کە بە دەس ئەکرێتۆ مەیخەرە ددان. «واتە: کاری سەهلت گران مەکە».
٢٩. گۆزەی سوور تا چل ڕۆژ ئاوی خۆشە.
٣٠. گۆزەی سوور هەموو ڕۆژێ لە کانی بە ساقی نایێتۆ. «تۆش بچیتە ناو شەڕ هەر وایە».
٣١. گۆش ئازیز، گۆشوارە ئازیز.
٣٢. گۆشت خۆی تاڵ ئەکا، قسەی بێ ئوسووڵ ئەکا.
٣٣. گۆشتمان لە ناو تیانەیەکا بە یەکەوە ناکوڵێ.
٣٤. گۆشتی ڕانی خۆت ببڕە تەواو بیخە سەر پێشە

بیخۆ، چش کە ئازارە، منەت قەساو مەکێشە

٣٥. گۆشتی ماسی لە هەموو گۆشتێ بێ زەرەرترە و حەڵاڵ ترە. ئاوی زەمزەم لە هەموو ئاوێ زەلاڵترو خۆشترە.
٣٦. گفتار نیك، رفتار نیك، پندار نیك. «ئەڵێن شیعاری زەردەشتی بووە، ئێستاش هەرکەس ئەم سێ ئەسڵە ببا بەرێوە، باشترین پیاوە بۆ دین و دونیا. کە ئیسلامیش هەر ئەمە ئەڵێت. جا برێك لە خەڵکی هەر بە تەواوی خۆشیان لە وشەی ئیسلام نایەت، وەگەرنە ئیسلام کامڵتر و باشتر ئەم باسانە شی ئەکاتەوە و دەستووری پێ ئەدات، بە وەسیلەی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر ﷺ».
٣٧. گوڵاڵە هەردانە، هەزار دەرمانە — خۆزگەم بەو خوشکە برای میوانە

«زووتر ئەمە ئاواتی ژنان بووە».

٣٨. گوڵاڵە مەسانە دەشتان دائەگرێ — تەماشا کردن هیچ کەڵك ناگرێ

«واتە: برۆ بەشوێن کار خۆتۆ».

٣٩. گوڵ بێ درك نابێ.
٤٠. گوڵ نیت، دڕکیش مەبە.
٤١. گوڵ دەسە برای پیسە، کە ئەبن بە هاوکیسە.
٤٢. گۆم تا قووڵ بێ مەلەی خۆشترە.
٤٣. گوێ بگرە بۆ هەموو وتارێ، چاك بێ یان خراپ. بکەوە شوێن چاکەکەی و

خراپەکەی وێڵ بکە.

٤٤. گوێرەکە سووره پێی پیا ناوه. «لەمەوپێش منالّیّ نەخۆش کەوتایێ یان شتێکی بەسەر بهاتایێ وەك کەوتن، بۆ ئەوه نەترسیّ ئەیانوت گوێرەکە سووره پای پیا ناوه. گوێرەکە سووره باڵدارێکی چکۆلە و بیّ ئازاره و وەك پەپوولە وایه و پێی ئەڵێن مامالیّ. هەروەها منالّ لەمەوپێش کە بکەوتایە پێیان ئەوت خوێکەی ڕژاند. بەوجۆره ژیر ئەبووەوه».

٤٥. گوێرەکەی خەڵکی گوێرەو سار ئەچڕیّ. «واته: ئەچیتۆ بۆ مالّ خاوەنەکەی، خۆت لەگەڵی ماندو مەکە».

٤٦. گوێرەکەی نەگبەت گوێرەکەی ئامەی بەستۆ. «گوێرەکەی نەگبەت چووه ناو زیان و

کوشتیان، گوێرەکەی ئامە نەچووه ناو زیان و نەیان کوشت».

٤٧. گوێز مەخە ژێر پێم با نەکەوم.

٤٨. گویّ لە مشت کەس مەبە، شەرع لە دەس مەده. بە گوێی واته و ویتەی کەس مەکە.

٤٩. گوێی خۆی لیّ خەواندووه. «واته: خۆی کردووه بە کەڕ»

٥٠. گەدا پاڵەوان خوایه، چونکه هیچێکی نیه تا لە خەڵك بترسیّ کە بیبەن.

٥١. گەدا دەوڵەمەن بیّ تا حەوت سالّ کەس بڕوای پیّ ناکا. دەوڵەمەندیش گەدا بکەویّ تا حەوت سالّ کەس بڕوای پیّ ناکا.

٥٢. گەدا گووی نەبیّ، «با فیز نەکات بە سەرمانا».

٥٣. گەدایی سالّیّ چەن هەزار تمەن زەرەرم لیّ ئەدا. کە نیمە بە هەرزان لە وەختی خۆیا شت بسێنم.

٥٤. گەڕان بە شوێن زانینا فەرزە لە سەر هەموو کەس

بڕۆ گەڕه بە شوێنیا تا پێت حەرەکەتی هەس
تۆ خوشکی یا خۆ برای، بە زانینۆ وەك چرای
با دەرسو وەعزت پیّ، خۆتۆ لە عالەم جیای

بـڕۆ بە شوێـن زانیـنا، با لـە چیـنا دەس کـەوێ
بازەحمەتێکی زۆرە، بەهرەت لێدەس ئەکەوێ

٥٥. گـەر بە ئـازادی نـەژیم، مردن خەڵاتە بۆ لـەشم
نۆکەری و سەردانـەوانـدن کـاری نامـەردانـەیە

٥٦. گەر بەهەشتم هەر بەتەنیا پێ بدەن ڕۆژی جەزا
نامـەوێ تـۆی تـیا نـەبی، حاشـا جینـانم بۆچـیە
«مامۆستا قانع»

٥٧. گەردنم لـە موو باریکترە لـە حەنای شەرع و قانوون ئیسلامدا.

٥٨. گەر دەپرسی من لـەبەرچی کەم دەخۆم من بە برسی قەت مەزانە، خەم دەخـۆم

٥٩. گەرمای هاوین نەتیجەکەی سەرمای زستانە، تا هاوین گەرمتر بێ زستانی ساردترە.

٦٠. گەرمیانی کە پیاویان پیر بوو ئەیکەن لـەگەڵ بەرغەلا، ئێمـە دایـان ئەنێیـن لـە مـاڵۆ بـا ئیستیراحەت بکەن.

٦١. گەرەکتە تەواو نۆك و نەخۆشەرەکەت پێ بێژم. «واتە: ئەتەوێ هەمووت بـۆ شـی بکەمۆ».

٦٢. گەرەکتە خاك بکەی بە سەرتا، بڕۆ سەر کۆگای گەورە.

٦٣. گەرەکتە خۆشت لێ بڕوا، خۆت بە لـە شێتی.

٦٤. گەرەکتە ناوت بە خراپە نەبەن، ناو کەس بە خراپە مەبە.

٦٥. گەزۆی داری مازوو داری ویوڵ نەبێ، گەزۆی دارەکانیتر بەکار نـایێ. «فارسـێ پرسی لـە کوردێك: گەزۆ چۆن بەرهەم دێت. بە فارسی‌یە کێفیلەکەی جـوابی دایـەوە و وتی: بە تەوراسی تیژەندە، لقە لقە بڕەندە، مەلۆ مەلۆ کونەندە، بە دوو لقی کوتەندە، بە بێژنگێ تەقوندە، گەزەندە هەی گەزەندە. هەر گەڵایێ گەزۆی پێـوە بـێ، لقـە لقـە بـە تەوراس ئەیبڕی، مەلۆ مەلۆ دایئەنی تا دوو یا سێ ڕۆژ وشك ئـەبێ، دوای ئـەوە لـەسـەر مەوجێ دایئەنێی و بە دارێکـی دوو لقـان لـەسـەر مەوجەکـە گەزۆکـەی دائـەوەرێنی و گەڵاکەی بەو دوو لقە جیا ئەکەیتۆو باقیەکەی بە بێژنگ ئەبێژی، گەزۆکەی دائەدا. ئـیتر بۆ خواردن باشەو نوقڵی سروشتی و کوردییە».

٦٦. گەماڵ زۆری بۆ بێنی بە قەد تانجی ڕا ئەکات
کەسێ تەجرەبەی بێ، بەم قسە بڕوا ئەکات

٦٧. گەماڵ کە پیر بێ، لە ڕاو ئەکەوێ، وەلێ لە حەپە و وەڕە ناکەوێ. «بێ حەیاش هەروایە».

٦٨. گەمە تاوێ خۆشە، ئەوەندە خۆشە لە تاقەت دەرنەچێ.

٦٩. گەمەمان گەمەیە، کلکە قنگێمان هەر گەمەیە.

٧٠. گەمە و گاڵتەی کەر، یا گازە یا گووز | یا هەڵخستنەوە یا هەڵجووز هەڵجووز

٧١. گەنجت بە بار بێ، بە ژەهری مار بێ | ئەمساڵ بە قوربان ڕۆژێ لە پار بێ
تاڕەنج نەکێشیت و خۆت ماندو نەکەی | خۆت بە ساحێوی گەنجینە ناکەی

٧٢. گەنج وا لە پێی ڕەنجا.

٧٣. گەوج، نەچێتە بازار، بازاڕ بۆ گەن ئەکات.

٧٤. گەوج وڕاجە.

٧٥. گەورە ئاو ئەڕێژێ، بچووك پێی تێ ئەخا.

٧٦. گەورە ئەو کەسەیە کە خزمەت بە خەڵك ئەکات.

٧٧. گەورەی وڵات دڵی بە خراپی لەگەڵ میللەتا بگۆڕێ، بەرەکەت لە وڵاتا نامێنێ.

٧٨. گەورەیی بە عەقڵە، بە ساڵ نیە. «پرسیان لە حەزرەتی عەباس ﷺ مامی پێغەمبەر ﷺ، تۆ گەورەتری یا موحەممەد ﷺ، وتی: لە عومرا من گەورەترم لە عەقڵا ئەو».

٧٩. گەوریی بۆ موسڵمان ئەبێ. «ئەوەندە زەلیلە».

٨٠. گەوهەری وتاری خۆت لەگەڵ نائەهلا خەسار مەکە.

٨١. گەیشتی بە ترۆ، لێیدە بڕۆ | با ئابڕووت نەچێ نەبی بە پەڕۆ

٨٢. گەدێ و گاوێ / سەرەو ماساوێ / ئاوەو کارێزی / قنگەری ڕێزی / گەناو بەیێ / ماس و مەیێ.

«بە کوردی: ورگی گا / سەر ماسی / ئاو کارێز / قنگری ڕیخ / بەی گەنیو / ماسی مەڕ. هەورامی بە سەلیقە و تەجرەبەی خۆیان ئەمیانە وتووە کە خۆشن».

٨٣. گیا خۆری لە بەهاردا لە هەموو نیعمەتێ خۆشترو باشترە بۆ بەدەنی ئینسان.

«وەختێ مەلا ئەبووبەکر «موسەننیفی چۆڕی» لە مەریوانی تۆراوە و چووە بۆ سۆڵەی عێراق بۆلای ساداتی خالۆی و تاقەتی چووە بۆ کەلانەی پیچك، فەرموویەتی:

پیچکی تەرچك جنیاگی دۆڵە　　　باشترە لە پیازی سۆڵیای سۆڵە

پیچك بجنی تەبعەن چاوت ئەسۆڵێتۆ، بەڵام ئەگەر دوو سێ چڵ لەو وەختا بنێی بە سەرتۆ، ئیتر چاوت ناسۆڵێتەوە».

٨٤. گیا لەسەر بنجی خۆی سەوز ئەبێ. «بەشەر ئەچێتۆ سەر بنەماڵەی خۆی».

٨٥. گیان خۆشەویست مەبە، کاریگەر بە.

٨٦. گیان زۆر خۆشەویستە، وەلێ گیان ئەکرێ بە فیدای ئابڕوو.

٨٧. گیانم بە فیدای خەم بێ کە نایەڵێ تەنیا بم
ئەگەڕێ و پەیام ئەکا لە هەرکوێ بۆی پەیا بم

٨٨. گیان وا لە جێی سەختاو دەرناچێ. ئەگەرنا ئەبوا هەر زوو تەواو بوایێ لە خەما.

٨٩. گێجەنەی دەرگاکەتم لەسەر چاو دابنێ، نالێم وەی، ئەوەندە تۆم خۆش ئەوێ.

٩٠. گێرەکە سەر پەڕی مانگا بێ، ئەبێ هەمیشە نامیزان و شێواو بێ، «سەرۆکی باش هەڵبژێرن با میزانتان تێك نەچێ».

٩١. گێرە شێوێن مەبن. «لەوەو پێش خەرمانیان بە گا ئەکوتاو چەن گایان ئەبەست بە گوریسێکەوە و پێیان ئەوت گێرە، بەویانە کە لای چەپ و لە ناوەڕاستی خەرمانەکەدا بوایێ ئەیانوت بنە و تەبیعەتەن ئەبوا گایێ زلە و تەمەڵ بوایێ، بەویانە لای ڕاس و لە لای پەڕی خەرمانەکە بوایێ ئەیانوت سەرپەڕو ئەبوایێ گایێ سووك و زیرەك و ئازاو وریا بوایێ. بە هەر گایێکیان کە سەروەشێن یا لەقە وەشێن یا خەفوك بوایێ ئەیانوت گێرە شێوێن. ئێستاش کەسێ کاری خێری خەڵکی تێك بدا، پێی ئەڵێن گێرە شێوێن».

٩٢. گێجەنەی درگاکەت بگۆڕە. «واتە: ژنەکەت بە کەڵك نایەو تەمبەڵە، تەڵاقی بدەو یەکێ تر بێنە».

***

# پیتی <ل>

## پەندی پێشینان

١. لـە پـرِێ نـابـێ بـە کـورِێ.

سـەبرو حەوسـەڵە و تاقـەتی ئـەوێ		تا پلە پلە و کـەم کـەم سەرکـەوێ

٢. لازمە بـۆ شێـخ سبەینان گوربە خەو		تا بلێن شێخ زاهیدە و نانوێ بە شەو

«شێخ رِەزای کەرکوکی بەیانیەك زوو رِۆیشت بـۆ مـاڵی شـێخ عـەلی تاڵـەبانی، بـرای دێوانەیەك لـە دەرگادا وێستا بوو، وتـی: کـوا شـێخ؟ دێوانەکـە نەیناسـی و وتـی: شـێخ خەوتووە. وتی هەڵسا لەخەو ئەم کاغـەزەی بـۆ بـەرە. لـە کاغەزەکەیـشا ئـەم پەنـدەی نووسی....»

٣. لای خوا بەرمەدە با لات چۆڵ نـەکا		رِیسوای لای قەوم و عەشرەتت نەکا

٤. لای ژوورژ جێی ناکەنۆ، لای خوارۆ دانانیشێ.

٥. لووت لـە بەینا نەبێ، چاو چاو ئەخوات. «بوونی زاڵـم باشە بۆ فەقیرو هەژار».

٦. لە ئاخر زەمانا دین وەکوو ئاوری لـێ دێ، ئەیخەیتە مشتت خۆت ئەسووتێی، تـوورِی ئەدەی عالـەمێ ئەسووتێ.

٧. لە ئەوەڵی زستانۆ، بەفر ئەڵێ بە شەماڵ: بە سەر حەسـەن پـەپوو سـەر، سـەرت لـێ بنێمەدەر، نە گات بێڵم و نە کەر.

٨. لە نیوەی زستان بەولاوە شەماڵ ئەڵێ بە بەفر: بە سەر حەسەن سەرلاران، سەرت لـێ بێنمە دیاران، ئەتپێچمە قونی نزاران.

٩. لە ئەوەڵی زستانۆ بەفر ئەنێرێ بۆلای هاڵەکۆك کە شووی پێ بکات، ئەویش ئەڵێ:

نە پـرژم هەیە و نە باڵ		چیمە لـە سەر ماڵ و حاڵ

لە نیوەی زستانۆ بەولاوە هاڵەکۆك ئەنێرێ بۆلای بەفر بێت کە شووی پـێ ئەکـەم. بـەفر ئەڵێ:

شۆرِ شۆرِ نیشتووە لە بن گونـم		چیـمـە لـەسـەر مـاڵ و ژنـم

«وادیارە ئیتر مامەڵەیان سەری نەگرتووە».

١٠. لە «با» بێ و لە بۆران بێ، هەر لە بەفر کەم ئەبێتۆ.

١١. دوور بی لە فیتنە، دوور ئەبی لەوەی چارەی ئەوەیە کە گوێی پێ نەدەی

١٢. لەباتی خاسی، گوو بە کراسی. «کەسێ جەزای چاکە بە خراپە بداتەوە، وای پێ ئەڵێن».

١٣. لە زستان شەوێ، لە پیران تەوێ ئیتر بەسیانە بۆیان ڕێ کەوێ

١٤. لە بچووك خەتا، لە گەورە بەخشین بەمانە دنیا وابووە نەخشین

١٥. لەبەر بێ کەسی تۆم کردووە بە کەس نە بە کەسم بووی نە بە نیوەکەس

١٦. لەبەین دوو کەسا شەڕ وەك ئاورە فیتنە لەو بەینا خۆش کەر ئاورە

١٧. لە بەینی ژن و شوودا دەخاڵەت مەکەن خۆیان ئەزانن لە یەك چی ئەکەن

ئاشتیان ئەبێتۆو دەس لە مل ئەکەن

لە ئاخریشدا ئابڕووی تۆ ئەبەن

١٨. لە برسا مردن، لە ماڵی هەتیو خواردن باشترە.

١٩. لە بەتاڵی‌یا سەرم ئێشێ، کارێکم بۆ بدۆزەرۆ، خەم و خەفەتم زۆرە، هەمووی لە بیرم بەرۆ.

٢٠. لەبەر خاتر خاتران، یێمە سەردین کافران.

٢١. لە بێ خەبەران کەشکەك سەڵەوات. «کەسێ کە لە نابەڵەدی قسە بکاو نەزانێ باس باسی چیە، وای پێ ئەڵێن».

٢٢. لە بێشکەوە تا ئەمری، گەڕە بە شوێن زانینا

مامۆستاش ئازارت با، لێی مەکەوە بە قینا

زۆرو لێدان مامۆستا لەسەر خوێندن و زانین

باوك و دایك باشترە کە گەورە بووین ئەزانین

٢٣. لە پڕا نیوەیە و لە نیوەدا پڕە. «مانگ، کە لە پڕاو لە ئەوەڵەوە پەیدا ئەبێ نیوەیە و لە نیوەی مانگدا یانێ لە چواردە و پانزدە، پڕە و بە تەواوی و کامڵی ئەبینرێ».

٢٤. لە پیری‌یا پیاو فێر پلاّو خواردن بێ، دەس بۆ لووتی ئەبا.

٢٥. لە ترسا کونە مشکی لێ بووە بە عەمارەت.

٢٦. لە تر لۆتی سازترە.

٢٧. لە تۆ حەرەکەت، لە خوا بەرەکەت.

٢٨. لە جێگەیەکدا بخەوە، ئاو نەیێتە ژێرت.

٢٩. لە جێگەیەکدا دانیشە هەڵت نەسێنن.

٣٠. لە جێی شابازان، کۆرکۆرە وازان.

٣١. لە جێگەیەك ئاو هەیە، زەوی نیە. لە جێگەیەك زەوی هەیە، ئاو نیە.

٣٢. لەچك بەسەر زۆر بە ڕەحمە و جێگەی ڕەحمە.

٣٣. لەچکەکەم جاوگ بێ، حەوت کەڕەت لکەوناو، بەو شەرتە شووەکەم لاو بێ. «ئاواتی ژنە»

٣٤. لە چوارپادا قورسی هەیە و لە ڕەشە ولاخا دێزە. «واتە: ئەوەندە هەژارە».

٣٥. لە خاك ئەمین ترە.

٣٦. لە چواردیواری خۆتانا ناو کەس بە خراپی مەبەن. «دیوار مشکی هەیە، مشکیش گوێچکەی هەیە».

٣٧. لە حەدیسا هەیە: خۆتان بخەنە بەر بای بەهار وەکوو دارو گیا پێی ئەگەشێن و زیاد ئەکەن. خۆتان لە سەرمای پاییز بپارێزن وەکوو درەخت و گیا، گەڵا ڕێزی پێ ئەکەن، بۆ ئێوەش خراپە.

٣٨. لە خوا داوا کە چیت ناتەواوە    بۆ دین و دنیا هەر خۆی حەساوە

٣٩. لە خوا داوا کە، هەرچیکت ئەوێ    مەگەر خوا خۆی فریامان کەوێ

٤٠. لە خواردنا هارە و لە لەشیا بیمارە.

٤١. لە خوا کە شەرمی نیە، لە بەندە چۆن شەرم ئەکا

کەسێ حاڵی وەها بێ، ژیر چۆن بڕوای پێ ئەکا

٤٢. لە خۆ بایی بوون، زەرەری زۆرە    زەرەر زۆر لە خۆت مەدە بەو جۆرە

٤٣. لە خۆتۆ مەبە بە کوتەك قوڕاو    با ئابڕووت نەچێ نەتخەنە ناو ڕاو

٤٤. لەخۆتۆ کەس بە خراپ مەزانە، تا بەڵگەی لێ نەگری.

٤٥. لە خۆ ڕازی پێش ناکەوێ.

٤٦. لە خۆم نەکەوتووە، لە چاکی کەواکەم کەوتووە. «شەڕ فرۆشیٚ، شەقیٚکی هەلْدا لە پیاویٚ لاشەڕ، ئەویش بۆ دەربڕینی لاشەڕی خۆی، ئەمەیە وتووە».

٤٧. لە خەجالەتی گوناحباری خۆم خەریکم ئەڕۆم بە درزی عەرزا. «واتە: لە من خراپتر نیە لە ڕووی سەرزەوی».

٤٨. لە دنیادا دوو کەس بە پەشیمانی ئەمرن، یەکەم کەسیٚ کە مالّی دنیای هەیە نایخوات، دووهەم کەسیٚ کە ئەزانیٚت و نایکات.

٤٩. لە دوای باران، کەپەنك.

٥٠. لە دوای پەن دان، خەفەت خواردن بەکار نایێت.

٥١. لە دوای ترِیٚ، خەمشەی برِیٚ.

٥٢. لە دۆعاو نزای خیٚر کە تیٚر ناخۆی بۆچ بۆ عیبادەت خەمی خۆت ناخۆی
وەختیٚ کە تووشی بەلاّو شەڕ ئەبی لە لوتفی خوا بۆ مەئیووس ئەبی
بە تۆبە و بە هاوار هاوار ڕوو کەرە دەرگای غەفوورو غەففار

٥٣. لە دوای بای توند، باران ئەباریٚ.

٥٤. لە دەرگاوۆ دەرم کەن، لە کۆماجۆ دیٚمۆ بۆ لاتان، ئەوەندە موشتەریتانم.

٥٥. لە دەمتۆ ئەڕوات، لە دواتۆ بیٚتۆ ئەم هەموو ڕزقە کە کۆی ئەکەیتۆ
حەرام و حەلاّلْ تیٚکەلّی مەکە خۆت لە حیسابا خەجالّەت مەکە

٥٦. لە دیوار شکستە و لە ژن سەلّیتە و لە سەگ لانگر خۆت بپاریٚزە.

٥٧. لە ڕاستی ڕەحمەت ئەباریٚ، وەك لە ناڕاستی زەحمەت.

٥٨. لە ڕۆژی تەنگانەدا ئینسان قەرزی کۆن و قەومی دووری بە یاد ئەکا.

٥٩. لە ڕەحمی دنیای خوا حەفتا و هەشتە بەشدارم
بۆ ڕەحمی ئاخیرەتی هەمیشە ئینتیزارم
یا ڕەحیم و یا ڕەحمان، لەلای تۆ زۆرە بەشمان
چاوەڕوانی ڕەحمی تۆین، مەیبڕە خیٚرو بەشمان

٦٠. لە زیناو ستەمکاری حاکم، وشکە سالّی پەیا ئەبیٚ. «حەزرەت عومەر ﷺ»

٦١. لە سووزن بیٚ کەس ترم.

٦٢. لە سەر ڕێگای خەڵکی دانیشی، ئەبێ جوابی سڵامیان بدەیتۆو چاو لە عەیبیان بپۆشی.

٦٣. لە سەر ماڵم دای لە باڵم. «یا: لە سەر ماڵم بدە لە باڵم»

٦٤. لە سەر مردوو دڵی زیندو مەیەشێنن، مردوو ڕۆیشتووە بە ڕێی خۆیەوە، تۆ خێرو خێرات و فاتیحەی بۆ بنێرە.

٦٥. لە شەڕ ئەو کەسە بترسە کە چاکەت لەگەڵ کردوە.

٦٦. لە شەل هەڵکەوتم، کەوتم بە کوێرا　　خوا بەشی منی هەر شەل و کوێر دا

٦٧. لە شێر ترسان مەنعی نیە　　هەڵمەت بێنێ چارەی چیە؟

٦٨. لە عان کەڵك‌وکار ئەمانکا بە یار　　لە عان جزو بز ئەمانکا بە دز

٦٩. لەعنەت نامەت بێ نەچیتە هەوار　　هەرتاکو نەڕوا سێ شەش‌و سێ چوار

«واتە: تا نەڕوا ۳۰ ڕۆژ لە بەهار».

۷۰. لە شەوگاری درێژا شەونشینی خۆشە، لە ڕۆژگار درێژی‌یا ڕۆژ نشینی. «بۆیە وتوویانە:

یاخوا بەخێر بیت میوانی ئازیز　　با بە ڕۆژ بەهار، با بە شەو پاییز»

۷۱. لە عەلامەتی ئاخر زەمانە کە دەسەیەك پەیا ئەبن کە بە لەهجە و دەنگی خۆش و تەجویدی چاك، قورئان ئەخوێنن. بەڵام لە قوڕگیان ناچێتە خوارۆ چونکا ئیمانیان پێی نیە و عەمەڵی پێ ناکەن. «حەدیسە» ئەمانە لە عیلمی فەلایی‌یا، هەر خەرمان سووتانن ئەزانن، لە عیلمی مەلایی‌یا هەر بەرنوێژی.

۷۲. لە قاڵبی دۆستیدا دوژمن ئەتوانێ زەرەری زۆرترت لێ بدات. «هۆشت بە خۆتۆ بێ».

۷۳. لە کاری خراپا، یا نەزان بە، یا خۆت بکە بە نەزان.

۷٤. لە کانی جەرگمەوە دێتە دەرۆ، بە شۆخی نایلێم.

۷٥. لە کانییەك ئاوت خواردۆ، بەردی تێ مەخە. «بێ وەفایی ئەنوێنێ».

۷٦. لە کۆگای گەورە خۆڵ پێوی باشە　　لای پیاوی گەورە، سکاڵا باشە

۷۷. لە کەس مەترسە لە خالق نەبێ　　ئەو ئەیدا بە تۆ هەرچێکت نەبێ

٧٨. لە کوولەکەی دەرویش ناو خالّیترە.

٧٩. لە کولّە چوارشەممەی مانگ سەفەر سوورترم. «بە ئاخرین چوارشەممەی مانگ سەفەر ئەڵێن کولّە چوارشەممە».

٨٠. لە کەم، کەم ئەکوژرێت و لە زۆر زۆر. «دەسەی کەم و بێ دەسەڵات بە دەسەی زۆرو دەسەڵاتدار وا ئەڵێن و هەڕەشەی لێ ئەکەن».

٨١. لە کێ ئەکا چاوەکەی / لە خالۆ لەولاوەکەی
لە کێ ئەکا ڕەوشتی / لە خالۆی شێر لە پشتی
لە کێ ئەکا دوو شانی / لە خالۆی لاوو جوانی
لە کێ ئەکا لووتەکەی / لە مامە نابووتەکەی
لە کێ ئەکا تەوێلّی / لە مامەی گێل و وێلی
لەکی ئەکا بڕۆکەی / لە مامە جل دوورەکەی

«دایکێك کوڕی منالّی هەڵپەڕاندووە و ئەم شێعرانەی وتووە. دایکێکی تریش بەم جۆرە کوڕی لاوی لاواندووەتۆ: لە کوێ بووی، لە ناو پیچك و مەنێ بووی، لە باخەڵی ڕەنێ بووی».

٨٢. لە گیرفان چەپۆ پووکێکم نا لەسەر ئەو پەنەی پێی دام. «بێ دەسەڵات وا ئەڵێ».

٨٣. لەگەڵ ئەسلّان هەموو فەسلّان / لەگەڵ نا ئەسلّان مەیکە وەسلّان

٨٤. لەگەڵ ئەو کەسا هەڵە و هەرزەیە / هەرچەن جوانە و وەکو تەرزەیە
ڕەفیقی مەکە، ئەتخا بە خەتا / تووشت ئەکا بە تووش گوناحو خەتا

٨٥. لەگەڵ قەتارچی ئاشنایی مەکە / یا جێگە و ڕێگەی بۆ ئامادە کە

«ئیشارەی گولّستانە»

٨٦. لەگەڵ گەورەتر لە خۆت بەشەرم و ئێحترام بە، وە لەگەڵ بچووکتر لە خۆت بە ڕەحم و میهرەبان بە. «حەدیسە»

٨٧. لەگەڵ نائەهلا شەڕ و ستیزە / ئابڕووت ئەبات، ئەتخا لە زیزە

«نامی»

٨٨. لەگەڵ نەفاما زۆر فامیدە بە / عێزەتو حورمەت خۆت لەدەس مەدە

موسوڵمان ئەبێ وەختێ کە نەفام خراپی پێی وت، ئەم بڵێ سەلام
«ئیشارەی قورئانە»

٨٩. لە گەڵ گورگا گۆشت ئەخوات لەگەڵ شوانا شیوەن ئەکات
٩٠. لە لاوی‌یا فریای خۆت نەکەوی لە پیری‌یا هیچ ناکرێ هەر ئەکەوی
٩١. لەلای ئاسنگەر کەسێ دانیشێ یا جلی ئەسووتێ، یا سەری ئێشێ
٩٢. لە گیرفان چەپۆ پێم ئەدات و لە گیرفان ڕاسۆ لێمی ئەسێنێتۆ.
٩٣. لە لای دیزەوە دانیشی، ڕەش ئەبی، لای خیگەوە دانیشی چەور ئەبی، لە لای عەتار دانیشی بۆن خۆش ئەبی.
٩٤. لە مازوودا تێ شکاوە، لە سیچکەدا قەرەبۆی ئەکاتۆ.
دار مازوو برا سەمەری زۆرە بێ‌سەمەر تۆ بووی دەرچووی بەم جۆرە
٩٥. لە ماڵ دەرمەچۆ شەو بە شوێن دزا تووشی خۆت مەکە مەینەت و سزا
٩٦. لە ماڵی ئێوە نان بخۆین و بڕۆین بۆ ماڵی ئێمە گەمە بکەین. «مناڵێ فیلاوی وای وتووە بە یەکێکی‌تر».
٩٧. لە ماین دابەزیت و سوار کەر بووی. «دەرەجەت هاتووەتە خوارەوە».
٩٨. لە ماین نەبوو، ئاخورِ ئەبەسی فیزو دەمارێ مەکە بە برسی
٩٩. لەم دنیا برا خراوتر نیە خەفەتباری‌یە، هەیە یا نیە
١٠٠. لە مریشکیان پرسی: بۆچی ئەقیژێنی؟ وتی: گوێم وا لە قرچەی ڕەفیقەکەمۆ لە ناو تاوەدا، بۆیە ئەقیژێنم.
١٠١. لە مەرگ ناخۆشتر ئەو بەلاّیەیە کە بە بۆن ئەوەوە داوای مەرگ لە خوا ئەکەی.
١٠٢. لە مەلای مەزبوورەیان پرسی: خەڵکی کوێی؟ وتی: هێشتا ژنم نەهێناوە.
١٠٣. لە ناوکوردا نەبوو پەیمان شکاندن لەکوێ فێر بووی گوڵم پەیمان شکێنی
١٠٤. لە ناو کوێرانا مژموور سەر باشقەس وەها ئەزانێ وێنەی نیە کەس
١٠٥. لەنج مەکە لە دەس دۆس و دوژمنت دۆس ڕاستەقینەت، بێ بە دوژمنت
قسە دابڕین لە موسوڵمانان لە سێ ڕۆژ زیاتر حەرامە، ئامان
بە قسەی خۆش و بە شەرعی ئیسلام موشکڵ حەل ئەبێ نەك تەرکی کەلام

ئەوەی کە زۆرتر زەرەرییە، لەنجە دڵ ئێشاندن و مەینەت و ڕەنجە

١٠٦. لەوانە بترسە کە لە خوا ناترسن.

١٠٧. لە نزار نایخاتە خۆرەتاو لە ئەوەڵۆ بۆ بەیانی خێرایی تانجی دانراوە. «ئێستا کەسێ لە کارێکا خێرا بێ، وای پێ ئەڵێن».

١٠٨. لە نۆ کیسە قەرز مەکە، ئەگەر کردت خەرجی مەکە. نەکا داوای بکات و شەرمەساری ببی.

١٠٩. لەوانە بترسە کە چاکەت لەگەڵ کردوون.

١١٠. لەو قوڕە ئەو تۆزە هەڵساوە، ئاسمان ستوونی ئەوێ.

١١١. لەوە بترسە کە بێژێ ناخۆم نەك بێ بە سەریا بلێ تۆیش ئەخۆم

١١٢. لەوە بترسە لە خوا ناترسێ لە پاك و پیس و حەرام ناپرسێ

حەیایشی نیە بەرگیری بکا بێ حەیا هەرچی مەیلی بێ ئەیکا

١١٣. لە وەختی شەڕا ئاشتیت لە بیر بێ نەکا لەو بەینا کارێکت گیر بێ

١١٤. لە وەختی خۆیا کۆمەك بکە بە فەقیرو هەژار، خوا خۆی هەزاران دەردو بەڵاو مەینەتت لێ دوور ئەخاتەوە.

١١٥. لەوەو پێش جەردە ئەیدا بە هەردا خۆی ئەدا بەسەر شەخەڵ و بەردا

١١٦. ئەمجا ئەیتوانی شتێك بڕفێنێ بەینێ بیبات و بەینێ بیهێنێ

ئێستا جەردەکان وان لە ناو بانگدا وان لە ناو خەڵك و ئیدارەکاندا

بە تایبەت دوکتۆر نەخۆشخانەکان خەڵك ڕووت ئەکەنۆ وەك زووی جەردەکان

خەڵك فریو ئەدەن وەکو جنۆکە پاکی ئەکەنۆ وەکو پیشۆکە

داخ بەیان ئەکەم، بەم نامیلکەمە هەرچی بنووسم هێشتا هەر کەمە

ڕۆشنتر لە من ئەمە بنووسە داخ دڵ دەرئەکا ئەم نامە نووسە

١١٧. لە وێرانەدا خەزێنە ئەدۆزرێتەوە، «لە بنەماڵەی خراپا، پیاوچاکی گەورە هەڵئەکەوێ».

١١٨. لە هەر جێێ مەگەس جەم بێ، یەقین شیرینە بێ شك

چ حاجەتیە شەکر هاواری لێ هەڵسێ کە شیرینم

۱۱۹. لە هەر شوێنێکۆ نیعمەتت بۆ بێ    هەر مەیشوێنە با هەر وەها بێ
۱۲۰. لە هەشت دەرگاوە ئەڕۆن بۆ بەهەشت    بۆیە وا ناوی نراوە بەهەشت
۱۲۱. لە هەرکوێ باری کەوێ ساحێو ماڵ، لە هەموو کەس زووتر لێی ئەنەوێ.
۱۲۲. لە هەر کوێ پیاوی گەورە دانیشێ، ئەویا لای ژوورووە.
۱۲۳. لە هەر کوێ چێشت و ئاشە، کەچەڵ بۆ خۆی فەڕاشە.
۱۲٤. لە هەموو پرسیارێك ناخۆشتر ئەوەیە کە بپرسیت لە ژن، تەمەنت چەنێکە؟ یا وەڵام ناداتۆ یا ئەڵێ بە تۆ چی و ئەگەریش زۆر بکا لە خۆی و جواب بداتەوە، پانزدە، بیست ساڵ کەمتر لە عومری خۆی ئەڵێ. «کەوابوو نەپرسین باشترە».
۱۲٥. لە هەموو دوژمنێك، دوژمن‌تر بە تۆ نەفسی خۆتە، کە هەمیشە وا لەگەڵتا. تۆ ئەو مەشغووڵ نەکەی بە ئیحسان و عیبادەت، ئەو تۆ مەشغووڵ ئەکا بە گوناح و مەعسیەت.
۱۲٦. لە هەموو کاسەیەکا کەوچك مەبە. «لە هەر کارێکا خۆت تێ مەگەیەنە».
۱۲۷. لە هەموو کەس بەخێڵ‌تر کەسێکە کە ناوی من لە لایا ببرێت و سەڵەوات نەدا لە دیارم. «حەدیسە»
۱۲۸. لە هەموو کەس خراپتر کەسێکە کە دینی فرۆشت بە دنیا بۆ خۆی و لەویش خراپتر کەسێکە کە دینی فرۆشت بە دنیا بۆ غەیری خۆی. «حەدیسە»
۱۳۰. لە هەموو کەس گەورەتر لای خوا کەسێکە کە پارێزی زۆرتر بێ لە گوناح. «ئیشارەی ئایەتە»
۱۳۱. لە هەموو کەسێ دزتر کەسێکە کە لە نوێژەکەی دزی ئەکات. «حەدیسە. دزی نوێژ ئەوەسە کە بەباشی شەرت و ڕوکنەکانی بەجێ نەهێنێ».
۱۳۲. لە هەموو گوناهێ گەورەتر ئەوەیە کە بەشەر خۆی بەبێ گوناح و مەعسووم بزانێ. «حەدیسە»
۱۳۳. لە هەموو ناخۆشییە ناخۆش‌تر لارە ملی لای دوکتۆرو دەرمانە. «پارێز بکە با نەخۆش نەکەوی و لەبەردەسی دوکتۆرا نەبی».
۱۳٤. لە هەموو هەورێ باران نابارێ. «هەموو هەڕەشەیەك زەجرو داخی لێ پەیا نابێ».

١٣٥. لێدان لە دەس دۆس وەکو میوژە　　　　بیخۆو وەکو ئاو باشی هەڵمژە

١٣٦. لێم ئایەنە، جێم کایەنە.

١٣٧. لە «با» باران ئەخێزێت، لە پیرە ژنیش وەی.

١٣٨. لە بەرا خۆت بناسە، کە خۆتت ناسی، خواش ئەناسی. «حەدیسە»

١٣٩. لە بیرتە کاتێ کە لەدایك بووی؟　　　　تۆ خۆت ئەگریای، خەڵك پێ ئەکەنین؟

وا بژی کەوا لە پاش مردنت　　　　تۆ خۆت پێکەنی و خەڵکی بۆت بگرین

***

# پیتی ‹ م ›

## پەندی پێشینان

١. ماچێ چیە، بۆ گەورە کچێ.

٢. مار ئاوی کە پیر بوو، قربۆق بە کلکی گەمە ئەکا.

٣. مار ئەکوژێت و بەچکە مار بەخێو ئەکات.

٤. ماران گەز لە گوریسی ڕەش و سپی ئەترسێ.

٥. مار تا سەری پان نەکەیتۆ بترسە لە وزە کردنی. «بەدکاریش هەر وایە».

٦. مار تا سەری نەیەشێ ناچێتە ڕێی کوتەك بە دەس.

٧. مار کە هیچ خۆشی لە سیر نەئەهات، سیر لەبەر کونەکەیا دەرئەهات.

٨. مار لە ئاو ناکوژێ، دوای ئاو خواردنەوە بیکوژە.

٩. مار لە توولە مار باشترە.

١٠. مار لە کونی خۆی دەرنایێ. «واتە: زستانە و خانە تەنگانیە».

١١. مارە تۆپیو ئەخاتە بەرپێم، ئەمترسێنێ.

١٢. مارەکەی پیر عومەرە پێچیا بە قاچما.

١٣. ماس نیە بە دەمتۆ دیار بێ. «واتە: هیچت لە بیر نیە و بێ وەفای».

١٤. ماسی لە ئاوی لێلا ئەگیرێ، هەتا دنیا نەشێوێ دز شتی دەس ناکەوێ.

١٥. ماسی لە بوارا ئەگیرێ.

١٦. ماسی لەناو ڕوخانەدا ئەفرۆشێ کە ڕەوا نیە.

١٧. ماسی هەر وەختێ بیگری تەڕو تازەیە، «کاری باش هەروەختێ دەستی پێکەی باشە».

١٨. ماش و ئاش بە بەختە. «لەمەو پێش لە چەمی زرێبارا تەیمانێکیان ئەتەنـد بـۆ ماسـی گرتن و پێیان ئەوت ماش، ئەگەر خاوەنەکەی بە بەخت بوایێ ماسی زۆری تێ ئەکـەوت. کەسێکیش خەلەی بردایێ بۆ ئاش، بەختی بوایێ زوو ئەیهاڕی و ئەهاتۆ».

١٩. ماشەڵڵا لە من مەکە، ماشەڵڵا لە مەلیك مەحموود بکە، کە هەر ڕانێکی بەقەی لاشەی گایەك ئەبێ.

٢٠. ماقوولێ جێگە بە ماقوولێ دانیشتووەکانیەتی.

٢١. ماڵ با بە «با» ئەڕوا        قسەیێ ڕاسە، پێم بکە بڕوا

٢٢. ماڵە با تیایا بێ،

٢٣. ماڵ برای جان و جان برای گور. «ئەمە فارسی‌یە و کورد زۆر بەکاری دێنێ. واتە ماڵ دنیا بۆ ئەوە باشە تا گیانت تیا ماوە و کە گیانت تیا نەما ئاخری هەر گۆڕە».

٢٤. ماڵ بە دەسەنە و سەدەقە کەم نابێتۆ، بە دزی و حیزیش بۆت کۆ نابێتۆ.

٢٥. ماڵ تا تەماشای نەکەی مەیسێنە        ژن تا تەماشای نەکەی مەیهێنە

٢٦. ماڵت ماڵ نەبێ، بازاڕت بازاڕ بێ.

٢٧. ماڵت بە کای سەرملە بێ، هەر پەلێکی کەوێتە جێیەك.

٢٨. ماڵی پڕە لە ڕازیانە و بە دڵ ئێشە ئەمرێ، «کە ڕازیانە دەوای دڵ ئێشەیە بەکاری نایێنی تا ئەمری. چ خاسترِ».

٢٩. ماڵت سەند، بەرلەوە تەماشای هاوسێکانت بکە. ماڵت بۆ عەوەز ئەبێ، هاوسێت بۆ عەوەز نابێت.

٣٠. ماڵ خۆت قایم بکە و سەگ هاوسێ ماڵ بە دز مەکە.

٣١. ماڵ خۆت بگرەو کەس بە دز مەگرە.

٣٢. ماڵ خۆ نەخۆر، بۆ چەکمە بۆر.

٣٣. ماڵ خۆم بۆ خۆم و ماڵی خەڵکیش وەك هەڵوا ئەخۆم.

٣٤. ماڵ دنیا سێ بەشی بۆ ساحێوەکەیە و باقی بۆ میرات خۆر. ئەوەی کە ئەیخوا، ئەوەی کە ئەیدڕێ، ئەوەی کە لە ڕێی خوادا ئەیدات.

٣٥. ماڵ ژنی ئەوێ، ژنیش گسکی ئەوێ، گسکیش بەنی ئەوێ. «زووتر ئەرکی ماڵ بە سەر ژنۆ بووە، بێجگە لە نان و چێشت و فرمان ناو ماڵ ئەبوا بەنی برێستایێ بۆ مەوج و بەرماڵ و قاڵی و بەڕو هۆڕو جاجم و ڕانك و چۆخە و درگا هۆڕو گسك بەستن. بۆیە ئەمەیانە وتووە کە ئەبێ ژن

حازرو نازری ئەم کارانە بێ جا شوو بکا. ئێستا شوکر بۆ خوا هەموو ئەرکێکیان لە کۆڵ کەوتووە و هەموو شتێ بە حازری دێتە بەردەسیان، هێشتا هەر منەتباریشن و نارازین و بیانوو گیرن».

٣٦. ماڵ سووتاو بە ماڵ ئەبێ، سکەڕۆ بە ماڵ نابێ.

٣٧. ماڵ قەڵب، سەر بە ساحێبەسی.

٣٨. ماڵ کەس بۆ کەس حەلاڵ نیە.

٣٩. ماڵ لە ساحێوماڵ نەچێ حەرامە.

٤٠. ماڵ لە مەریوان، دڵ لە دوو جێگە　　　خۆم ماتڵ ماوم لەم سەرە ڕێگە

«فۆلکلۆری کوردییە»

٤١. ماڵ لەو هەوار نەماوە، چیخ لەو دەوار نەماوە، دنیا تەواو گۆڕاوە. «واتە: ئاڵ وگۆڕ بەسەر دنیادا هاتووە و ڕەسم و یاسای زوو هەموو تیا چووە».

٤٢. ماڵم چوو بە ماڵانۆ، ئیتر چووە بە ناڵانۆ.

٤٣. ماڵم وا لە بێلوو، جووتم وا لە کێلوو. «واتە، ڕەتم بلاوە بۆم کۆ نابێتۆ. بێلوو و کێلوو بە تەرتیب دوو دێن لە مەریوانی ئێران و عێراق کە پێنج سەعات پیادە ڕەوی بەینیانە».

٤٤. ماڵم وا لەو پەڕۆ چیمە بە سەر سەگە شەڕۆ.

٤٥. ماڵە باوان قیبلەیە، ڕووتی لێ وەرمەگێڕە

جەلبی مەحەببەتیان کە، تۆ شەڕیان پێ مەگێڕە

٤٦. ماڵەکەت گشتی بڕوا بە تاڵان　　　یا خوا بیکا بە سەر بەش ماڵان

«دۆعای شەڕە»

٤٧. ماڵێ بنەڕەتی مەحکەم نەبێ زوو ئەڕوخێ.

٤٨. ماڵی بێ حەوشە وەسە ژنی بێ دەرپێ.

٤٩. ماڵی حەلاڵ ون نابێ، بۆیە منیش ماڵەکەم دۆزیوەتۆ.

٥٠. ماڵێ خۆشحاڵی هاتیا کە لەگەڵ خەڵکا بیخۆی.

٥١. ماڵی خۆم ئەدەم مەنێ دوو شایی　　　خۆیشم ئەگەرم پرزەی ئاوایی

٥٢. ماڵە و قەسەم خۆر بیبا.

٥٣. ماڵی خەڵکان تا لچ کەڵکان، ئیتر ئازا بیدەرۆ دەسیان.

٥٤. ماڵی سپی بۆ ڕۆژ ڕەش باشە. «ماڵی سپی: قەرانی زوو بووە».

٥٥. ماڵی فرە کەیبانوو خاکی ئەگاتە زانوو

«زانوو: ئەژنۆ، واتە: کەس نیە گسکی بدات و هەریەکە بە تەمای ئەوی ترە».

٥٦. ماڵێکم ئەوێ ویرانە نەبێ باخەوانەکەی زاو مەرگی نەبێ
ڕابەرێکی بێ هیچ پەروای نەبێ دەس‌گیرێکی بێ کەس هاوتای نەبێ
ئەو ماڵ بەهەشتە وێرانەی نیە باخەوان خوایە، زاو مەرگی نیە
ڕابەر جوبرەئیل هیچ پەروای نیە دەسگیر موحەممەد، کەس هاوتای نیە

٥٧. ماڵێ کە بە ئەو مەلوول بێ حاڵت ئەوە نەگبەتە نەك بە ئیقباڵت

«نامی»

٥٨. ماڵی کەم، گەمە بە خاوەنی ئەکا، هەرچی بیری لێ ئەکاتۆ نازانێ چی لێ بکات و بەش هیچ ناکات.

٥٩. مامان فرە بوو، سەر منالەکە لار ئەبێ.

٦٠. مامۆستایەك وتوویەتی: بەشەر چوار جۆرە: ساڵحی بەچکە ساڵح، ساڵحی بەچکە سەگ، سەگی بەچکە ساڵح، سەگی بەچکە سەگ. «ڕاستی فەرمووە، ئیشارەی ئایەتە».

٦١. مامە خەمە مەبە لە خۆتۆ، خەم بۆ کەس مەخۆ. «مامە خەمە پیاوێ بوو کە هەمیشە خەمی خەڵکی ئەخوارد. ڕۆژێ ڕۆیشت بو ماڵۆو وتی بە خێزانی: ئیمڕۆ بێ خەمم، چێشتێك باش لێ بنێ با بیخوێن. قوڵچماخێ گوێی لێوە بوو وتی: مامە خەمە خەمی هاوسێکەتان بخۆ، کەرەکەیان جاشی بێ کلکی بووە. خەم مامە خەمەی داگیر کرد، کە چۆن ئەو جاشە کەرە بێ کلکە مێش لە خۆی دەرکا. ئیتر نان و چێشتی بۆ نەخورا».

٦٢. مامەڵە لەگەڵ هەرکەسێ بکەی تەجرەبەی دین و دنیای ئەو ئەکەی
کەوابێ مامەڵە سەنگی مەحەکە تەسلیمی ببە و هەرای تیا مەکە

٦٣. مامە مامە، دنیا دەسەوامە تۆ بۆ من چۆنی، منیش هەر وامە

٦٤. مانگا ئەبەسرێتەوە نەك کەڵەگا. «هەر ژنێك ئەبێ هۆشی بە حەیای خۆیەوە بێ».

٦٥. مانگا بە دزیۆ کەڵ ئەگرێت و بە ئاشکرا ئەزێ.

٦٦. مانگا مردوو برادۆ بۆچی واز نایێنی تۆ

٦٧. مانگای گوێرەکەدار ناچێتە بێگار ئەرکی سووك بکە ژنی منالدار

٦٨. مانگای بێ وڵەت شیر ئەدا وەلێ لە ئاخرا لەقەیەکی لێ ئەداو ئەیرژێنێت. «واتە: پیاوێکی چاکە و خێرداره، وەلێ بە ئەزیەت و ئازاری دڵ خرابی ئەکا».

٦٩. مانگ دیارە هەوەجەی بە ئەنگووس کێشان نیە.

٧٠. مانگەشەو خۆی پاکە، با هەر سەگ بووەڕێ لێی.

٧١. مانگی ڕەمەزان وا هاتۆ بەخێر ئێمەش ئەیگرین بە گورچکی تێر

٧٢. مایەی ماڵەکەم کوتێ قالێیە لەملا دایئەخەم ئەولا خالێیە

٧٣. مایەی ماڵەکەم گێسکێ گەڕ بوایێ شەو باخەڵەکەم سەوڵێ تەڕ بوایێ

٧٤. مردم بمخەن بەلادا، با زوخاوی ماڵ و منالم لە دەمۆ بێتە دەرۆ.

٧٥. مردن بە جوانی و پیری نیە، تا پیرێ ئەمرێ سەد جوان ئەچن بەلادا.

٧٦. مردن مردنە و لازمە، ئەم لنگە فرێیەی بۆ چیە!.

٧٧. مردو ڕۆیشت بە ڕێی خۆیەوە، ناوی بە خرابی مەبە.

٧٨. مردوو بەم پاکییە نەشۆراوە کار بەم پوختەییە نەکراوە

٧٩. مردوو بێ کفن ناچێتە دەرۆ تۆیش کەست بێ شت مەکەرە دەرۆ

٨٠. مردوو مردو وەسیەت با بردی.

٨١. مردوو شۆر، مردوو شۆرانەی خۆی دەس‌کەوێ، مردوو گۆڕ بە گۆڕ ئەبوو.

٨٢. مردوو لە قەبرا نایێتە دەرۆ. «واتە: حەرامە بیهێنیتە دەرۆ. یا: لە سەری مەچۆو کار لە کار ترازاوە».

٨٣. مردوو مردن کۆسپێ گەورەیە و پرسە کەر تازە وچانن و بێ ڕەحم، سا بێ جوابی ئەم هەمووە بدەرەوە و ڕازی‌یان بکە. ڕەحمتان بێ یا مەڕۆن یا ڕایەك بەسە.

٨٤. مردوو ناشۆرێ، چووە بەربووەتە زیندووەکان.

٨٥. مردوو و زیندو، بە ئاو پاکی دێ.

٨٦. مرۆڤ بۆ ئیش کردن دروست کراوە، وەك باڵدار بۆ فڕین، «بەتاڵ دامەنیشە».

٨٧. مرۆڤــــ خــاوەن بــڕواو تەجرەبــەدارە، لــە کونێکــەوە مــار دوو جــار نایگــەزێ.
«حەدیسە»

٨٨. مریشك خۆی بەسەر خۆیا نەکا خۆڵ          ناکرێ بـە سـەریـا بە شـان و بە قۆڵ

٨٩. مریشك کە نەجاتی بوو لە هێلکە کردن، لە خۆشـیـا بـەیـنێ گراسـک ئەکات، ئەبێ تەحەمولی بکەن. «کەسێکیش کاسبیتان بۆ ئەکا، ڕازی ببەن بەرێوە».

٩٠. مریشك هێلکەش ئەکات و ڕێقنەش ئەکات. «بەشەریش خاس ئـەکات و خـراپیش ئەکات».

٩١. مزگەوت بڕوخێ میحرابی ئـەمێنێ          ئاساری چـاکە هــەر جێـی ئــەمێنێ

٩٢. مزگەوت جێگەی کەر بەستنەوە نیە.

٩٣. مسقـاڵە زەڕڕە لە خێـرو لـە شـەڕ          هیچی ون نابێ، گشت دێتە دەفتـەر

«نامی»

٩٤. مشت بدەی لە دیوار، دەس خۆت ئێشی پێ ئەگا نەك دیوارەکە.

٩٥. مشتەی ناو هەوانەکەی. «باوەژنێك زۆر ڕقی لە هەنە زاکەی بووە. بە هەوانەیـەك لێی داوە و ٩٦. مشتەیەکی خستووەتە ناوی بۆ ئەوە کـە ئەزیـەتی بگـاتێ و کـەس پێـی نەزانێ».

٩٧. مشتێ نموونەی خەروارێکە.

٩٨. مشك زۆر حەز ئەکا لە ئارد. «ئەڵێن جێگەیەك کە بیانەوێ بیکەن بە ئاش، حەوت ساڵ بەرلەوە مشك هێلانەی تیا ئەکاتۆ».

٩٩. مشك وتوویە بە مار: لە تۆ گازو لە من باز. «ماران گاز ئەگەر مـشك بـاز ببـات بەسەریا حاڵی خراپتر ئەبێ، بۆیە کەپریان بۆ ئەبەست».

١٠٠. مشك و مێلوورە لەو حەیوانانەن کە زەخیرە ئەکەن بۆ زستان و ژێرن.

١٠١. مشکێ خۆی کرد بە کونێکا، پـشیلەیەك چـووە سـەر کونەکـەی و وتـی: لــەم کونەوە بچۆ بۆ ئەو کونە نزیکە هەزار لیرەت پێ ئـەدەم. مـشکەکە وتـی: ڕێگـەی بـەم نزیکیە و لیرە بەم زۆریە، بێ مەلامەت نیە.

١٠٢. مفتە خۆر خۆش سەلیقەیە، ژیرو ژۆڵە و حەواسی جەمە.

۱۰۳. من ئـەڵێـم سیرو تـۆ ئەڵێی پیـاز قەولمان یەك ناگرێ بە خودای بێ نیاز

۱۰٤. من ئەڵێم ماس چەرمووە ئەو ئەڵێ ڕەشە.

۱۰٥. من ئەڵێم نێرە ئەو ئەڵێ بی دۆشە. «نێرە بیدۆشە ئەمەیە».

۱۰٦. من ئەیکەنم و تۆ بـیپێـوە. «واتـە: بـەڵامان بەسـەردا هـاتووە، چارەسـەری پـەیا بکەین».

۱۰۷. منالْ ببینـن بـۆ مـردن، مـالْ کەنۆ بۆ ویـران بوون

هەر وا بووە و هەر وایە، گەردشی چەرخی گەردوون

۱۰۸. منالْ کەوشی بە پێی باوکی کرد، بـاوك سـەر نەنێتـە سـەری باشـە بـا ئابڕوویـان نەڕوات. «منالْ هەرکام لـە دایك و باوکی خراپتر بێ، تابیع ئەویانـە ئـەبێ. بۆیـە سـەگ گورگ گلاوە، چونکو یەکێ لـە باوك و دایکی سەگە و ئەویان گورگ».

۱۰۹. منالْ لە لای چەپی دایکی بخەوێ، ئارامترو خۆشخەوتر ئەبێ، لەبـەر ئـەوە دلْ وا لای چەپۆ لـەلای ڕاسیەوە بخەوێ بێ تاقەت و کەم خەو ئەبێ. «تەجرەبەی حەکیمە».

۱۱۰. منالْ نان ناسە و خوا نەناس. هەولْی نانی حەلاڵیان بۆ بدە.

۱۱۱. من بۆ تۆ مردوو، تۆ من بە گووی سەگ حیساب نەکردوو. «گلەییە»

۱۱۲. من بەرزت ئەکەمۆ خوا خۆی بتباتۆ لاچـۆ لـە لامـا، شکـڵـت بـخواتۆ

۱۱۳. من دادمە لە دەس کارەکان گـەردوون شاڵێنــە لــە کـۆڵ لـێم بـووە بـە

۱۱٤. مـن خۆم پیرێکم یاخی بە یـاخی خاتوون نیشانەی پیریم ئینا جە شاخی

۱۱٥. «کەڵەکێوی چەند ساڵ عومری بێ، ئەوەندە گرێ وا بە شاخیۆ. ئەمە لە ئـەوەڵۆ بە ناو کەڵەکێویەوە وتراوە و ئێستاش پیران بۆ خۆیانی ئەڵێن».

۱۱٦. من حەز ئەکەم ڕۆژێ تێر بم و ڕۆژێك برسی بم، لـە تێرییا شوکری خـوا ئەکـەم مەسروورم، لە برسییا سەبر ئەکەم و مەئجوورم. «حەدیسە»

۱۱۷. من دانیشتووم لە یانەی وێرم، عالەم تەموورەی داوە لـە گـون و کێـرم، نـاییڵن بسرەوم.

۱۱۸. من دەرمان ڕەوانی ئەخۆم و خالۆم ڕەوان ئەبێ.

۱۱۹. من ڕازی و تۆ ڕازی، دارێ بە قنگ قازی. «ژن و پیاوی ئیمڕۆ زۆرتر بێ تەلاقن

و قازیو مەلا کە حوکم ئەکا بۆ تەلاقیان دوژمنیانە، بۆیە وا ئەڵێن».

١٢٠. من شەرتە شوان نادەم، ئەوان داوای پالآمزم لێ ئەکەن. «زووتر شوانیان ئەگرت و هەر سەرێ شتێکیان پێ ئەداو ئەیانوت پێی شەرتە شوان و بازێك کەرە و کولکەیان پێ ئەدا کە پێیان ئەوت پالآمز یان پێلآمز».

١٢١. من کلآوەکەم لە پۆپەوە دڕاوە، لە کەس باکم نیە.

١٢٢. من کوڕ خۆمم، ئێوەش کوڕ خۆتان بن. «خوا لێ خۆش بوو باوکم (مامۆستا مەلا باقری بالك)، لە جوابی ئێمەدا ئەمەیە فەرمووە کە گلەییمان لێ ئەکرد کە تۆ پیاوێکی پایە بەرزو هەڵکەوتووی و پیاوە هەڵکەوتووەکانیتر ماڵ و موڵکی زۆریان بۆ نەتەوەکانیان جێ هێشتووە و تۆ بۆ خۆت و بۆ ئێمە هیچ شتێکت نیە. فەرمووی: کەسێ لەم وڵاتا باوك و باپیری من ناناسێ و بۆ زۆر کار پەنا دێنن بە من، هەروەها ئەوانەی کە کەسداریشن. ئێوەش لەم دنیا پان و بەرینەدا هەوڵ بدەن بۆ خۆتان و من ئەمەمە ویستووە لە خوا کە پێی داوم».

١٢٣. من کە پارە بدەم مەلا لە مزگەوت دەرپێنم. «زووتر مەلا زۆرتر لە مزگەوتا بوون، بۆیە وایان وتووە».

١٢٤. من کە خۆم بیستم ناوی مەرگی تۆ — هیچ فەرقی نیە ڕاس بێ یا درۆ

١٢٥. من بەو خەبەرە خەفەت کوژ ئەبم — وێڵ و سەرگەردان هەردو کەژ ئەبم

١٢٦. من لەم بەرۆو تۆ لەو بەرۆ — هەردوکمان سووتاین لەبەر خۆرۆ

خوات لێ هەڵناگرێ، لایێ کەرۆ

١٢٧. من لەم داوە دەرناچم، مەگەر ڕا بکەم بە قاچم.

١٢٨. من مانگم بۆ خۆش بێ هەسێرەم بۆچیە.

١٢٩. من مانوو بووم، تۆ ئای ئای ئەکەی؟ من زەحمەت کێشم، تۆ کایە ئەکەی؟

١٣٠. من مردوو و تۆ زیندو. «ئەبێ ئەو کارە هەر وا بێ. پێشنیار ئەکا».

١٣١. من من و تۆ تۆ مەکە، هەرکامان فریای هەر کارێك ئەکەوین بیکەین.

١٣٢. من نان و ئاوی بێ منەت ئەخۆم — لە ڕەنجی شان و کەسبی خۆم ئەخۆم

١٣٣. من نەمخواردووە لەم کاسە — تا دڵم بیکا وەسواسە

١٣٤. من وێم مزانوو کام تۆمم کـالآن          خەلکی پەی هیممەت چەنی من نالآن

« مـەولـەوی تـاوەگـۆزی »

١٣٥. مۆجگاری تیێ نەگەیشتوو، وەسە گوێز بخەی بە دیوارا، «کە پیوە ناگرسێتۆ».

١٣٦. مەحەببەت هەر کەسێکت پیێ، لـە حەنای عەیبی ئەوا کەرو کوێری. بە تایبەت ژن و منالی.

١٣٧. موریدیێ کەر لـە شەش دانگ مولك خاسترە.

١٣٨. موسولمان خراپی ناکا تا عوزری بۆ بێنێتۆ. «حەدیسە»

١٣٩. موسولمان دەسی نەروا بە مووسایی ئەلێ بە ریش مەردانەت قەسەم.

١٤٠. موشکلێك نیە کە ئاسـان نەبێ          پیاو ئەو کەسەیە هەراسان نەبێ

١٤١. موو بە بەینیانا ناچێ، ئەوەندە جووتن.

١٤٢. موو لـە دەم یەك ئەبژێرن ئەوەندە کۆکن.

١٤٣. مووررووی دراوسێ بدزی، مەگەر بە شەو بیکەیتە ملت. ئەگەرنا لێتی ئەسێنێتۆ.

١٤٤. مووی بەدەن کە سپی بوو، خەبەرداره بۆ مردن

بەرەو رووی مـردن برۆ بە چـاکە و تۆبـە کـردن

١٤٥. مووی لووت بە مەقەس، مووی بن بالێ بکێش

وا باشـە بـۆ چـاو، مەتـرسە لـە ئێـش

«نامی»

١٤٦. موویێ لـە بەرازێ بکەنیتۆ، هەر باشە.

١٤٧. مەبە بە کەواسووری بـەر هـوردوو، مەبـە بـە کوتـەك بـە دەس دوای هـوردوو، بەدناوی. «واتە تەرکی کە هەردوو».

١٤٨. مەتیـلێ لەتـەرە ڕێسە بـۆ، بـە دم و هەرەکـەی ڕێسۆش. «واتـە: میمکـە تەشـی ڕێس بێ بە کێر کەرەکەیش بێ تەشی ئەڕێسێ. وتەی هەورامییەکانە».

١٤٩. مـەخـۆ شـتـێ تـۆ بـتـخـوا          مـەکـە کـارێ لـە پـات خـا

تریاك مەکێشە، لە پێ ئەکـەوی          هـەتاکو مـاوی، ئەکەویـتە زەوی

١٥٠. مەرگ لـەگەلْ هاومالآ جەژنە.

١٥١. مەڕ بە قاچی خۆی هەڵێئەواسن و بزنیش بە قاچی خۆی. «واتە: هەرکەس تاوان خۆی وا لە پێی خۆیا».

١٥٢. مەردانە بێ پەموو یانەیێ. «بەخت خۆت تاقی کەرۆ بزانە چۆنە».

١٥٣. مەرگ وەسە وشتر، لەبەر ماڵ هەموو کەسێکا ئەخەوێ.

١٥٤. مەرگیش بە نۆرەیە. «ئامادە بە! هاکا نۆرەی تۆش هات. بە ساقی و نەخۆشینیش نیە».

ساقێ لەسەر نەخۆشێ گریا هەتا بەیانی نەخۆشەکە چاکۆ بوو ئەویان مردبوو بەیانی

«لە گوڵستان وەرگیراوە»

١٥٥. مەڕمان نەدیوە، پشقەڵمان دیوە. «مەڵێ چاوی بە هیچ نەکەوتووە»

١٥٦. مەڕۆ بۆ ماڵ کەس، مەڕوانە حەوشی بەبێ ئیجازە، پیاوی بێ خەوشی

بدە لە دەرگا هەروا لەدووڕۆ هەروا لەخۆتۆ مەڕۆرە ژووڕۆ

١٥٧. مەرهەمی دڵ موسوڵمان تەنیا زیکری خودایە لەبۆ هەر موسوڵمانێ، یادی خودا دەوایە

١٥٨. مەشهوورە مەلا سوار هەرکەرێ بێ لێی دانابەزێ تا گیانی تیا بێ

١٥٩. مەڕێ گەڕۆڵ ڕانێ گەڕۆڵ ئەکا. «نەخۆشین واگیر پارێزی ئەوێ».

١٦٠. مەزهەب چوارە و کوتەك پێنج. کوتەك کۆمەکی هەرکامیان نەبێ حوکمی ئەویانە ئیجرا نابێ.

١٦١. مێعدەی ئینسان ئیحتیاجی بە سێ شت هەیە: خواردن و خواردنەوە و هەناسە. «مادام کەوایە، بیکە بە سێ بەشۆ».

١٦٢. مەکری ژنان باری خەرێ ئەینین لە خەر خەر نەبەرێ

١٦٣. مەکری شەیتان زەعیفە، مەکری ژنان عەزیمە

هیچ سەرت سووڕ نەمێنی، نەسی ئایەت کەریمە

«سوورەی «یوسف» ئایەتی ٢٨»

١٦٤. مەکە نە، مەدینە. «واتە: خۆش نشین بە وەکو حەزرەت».

١٦٥. مەگەر بە کەوچك بەشی بکەن. «ئەونە کەمە و بەشدار زۆرە».

١٦٧. مەلا خۆر بووە. «واتە زۆر حەڵاڵ و پاکە، هەر بۆ مەلا چاکە».

١٦٨. مەلا لە حورسا، فەقێ لە برسا، مووسایی لە ترسا، دۆم بۆ پەڕۆ، کامیان خۆش ئەڕۆ؟!. «واتە: هەرکەس بە نۆرەی خۆی».

١٦٩. مەلا و قەمە، جێی وەرهەمە، مەیکە بە گەمە. «واتە: نابێ مەلا ئەسلەحە هەڵگرێ بۆ کەس، بەڵکوو مەلا ئەبێ ئاشتیخوازی هەموو کەس بێ».

١٧٠. مەلاو میرەدێ قەولیان یەکگرێ — لەبەر حەملێیان کەس خۆی ناگرێ
ئەو بە حوکمی شەرع، ئەم بە زۆر بازوو — دنیا گشت ئەکەن بە مێشی مازوو

١٧١. مەلای «ضرار» و مزگەوتی «ضرار» — زۆریان زۆرە، لێیان کەن فێرار
تەماشای ئایەتی ١٠٩ بکە — لە سوورەی تۆبە و عەمەلی پێ کە
حەزرەتی ڕەسوول شای ساحێب ئیقباڵ — جێی مزگەوتەکەی کرد بەجێی ئەشغاڵ

١٧٢. مزگەوتێ بینای لەسەر تەقوایە — هەر ئەو مزگەوتە لە بۆ خوایە
تەفسیر مەداریك بەیانی ئەکا — هەرکەس مایلە بڕوا پەیای کا
«ضِرار، مزگەوتی مونافیقەکان»

١٧٣. مەلای ماوەران بە مێزەرەوە — بە شێخ و مەلای ڕەوانسەرەوە
گشت بێنن بۆ لام گشت بیکەن تکا — نایبەخشم، حەیا کە تکا، تکا

١٧٤. مەلای مەزبووره عارف و عالم و قسە خۆش بووە و حەزی کردوە قسەکانی لە ناو خەڵکا بلاو بێتەوە. وتوویەتی: کێری کەرەکەم بە قنگ ئەو کەسە ناوم ئەبات و حەوت حیکایەتم ناگێڕێتۆ. ناوی مەلا نەسرەدین بووە و من حەوت حیکایەتم زۆرتر لێ گێڕاوەتۆ.

١٧٥. مەلای مەزبووره وتویە: ئەچم بۆ بازاڕو کەرێ ئەسێنم. وتیان: بڵێ ئیشەڵڵا. وتی: پوولێ وا لە گیرفانماو کەرەکەش وا لە بازاڕا، ئیشەڵڵای بۆ چیە؟ تا چووە بازاڕ پوولەکەی گوم کردو کەرەکەی بۆ نەسنیا.

١٧٦. مەلووچك (چۆلەکە) خۆی چیە تا کەلە پاچەکەی بێ بە چی.

١٧٧. مەل هەیە گۆشتی ئەخورێ، مەلیش هەیە گۆشتی پێ ئەدەن بیخوات. «واتە: دنیا جۆراو جۆرە».

١٧٨. مەڵێ فلان‌کەس دوورە لە گەڵمان — هەر کاری ئەکەین نیە لە گەڵمان

خزمی خەزوورەی گووخلێ شێخە     هەتا ئەتوانی گۆشتی بۆ تێخە

١٧٩. مەلی گۆشت خۆر دەنووکی چنگە و چنگی تیژە و گۆشتی حەرامە، چونکا خۆی گۆشت خۆرە. «زاڵم و زۆردار هەر وایە»

١٨٠. مەمشۆرە بە گوواوێ، کارچاکی دوامۆ ناوێ. «واتە: لە ئەوەڵەوە تا ئاخر هەر باش بە»).

١٨١. مەن تا پڕ نەبێ، نارژێ، دڵ تا کەیل نەبێ گریانی نایێ.

١٨٢. مەنێ بپێوە سەر بگرێ، قسەیەك بکە کەڵك بگرێ.

١٨٣. مەیدارێنەرۆ کێلی مەقبەرە     مەیشیخوێنەرۆ بۆ چاو زەرەرە

١٨٤. مەیێڵە عومرت بڕوا بە فیڕۆ     فرمانی دوێنێ مەخەرە ئیمڕۆ

١٨٥. میراتی کەران هی کەمتیارە     ئەمە وتاری پیاوی هۆشیارە

١٨٦. مێلوورە بێت و هەموو یەك گرن     شێر لە بێشەی خۆی پێستی ئەدڕن

١٨٧. مەیموون جوان بوو هاوڵەیشی گرت، «جا بزانە ئەبێ چی لێ هاتبێ».

١٨٨. مێخ سندان با ئەبیات و کوروکە تۆسی ئەدەنە بەری.

١٨٩. مێشوولە لە حەواوۆ بڕوا بە سەرکۆمەڵێکا، ئەزانێ کامیان گرووپی خوێنی بە ئەو ئەخوات، ئەنیشێ بەویانۆو خوێنی ئەمژێ. ئەوەندە مەهارەتی تەبیعەتی هەیە.

١٩٠. مێلوورە لە هەموو گیانداری ژیرترە کە زەخیرە ئەکات و ئەو دانەوێڵە کۆ ئەکات و هەردوو سەرەکانی ئەقرتێنی کە سەوز نەبێ و تەڕیش بوو ئەیداتە بەر خۆر کە خراوتر نەبێ و وشکی ئەکاتەوە.

١٩١. میوان بۆ هەرکوێ بڕوا، بە ڕزقی خۆیۆ ئەڕوا، شتێکە ڕوو سوورییە بۆ خاوەن ماڵ.

١٩٢. میوان بە خولکی خانە خوێ بەنە     چەن ڕێك و پێك و جووان و پەسەنە

١٩٣. میوان ساتێ جاسووسی سەد ساڵە     ئەمە تەجرەبەی ساحێو کەماڵە

١٩٤. میوان فرە خانەخوێ لە برسا ئەمرێ.

١٩٥. میوان خێرۆ دەر بێ باشە، کۆمەك بکا بە ساحێب ماڵ لە ئیش و کارا.

١٩٦. میوان کەر خانەخوییە، ئەبێ بە دەستوور ئەو هەڵس و دانیشتە بکات تا لەو ماڵا

بێ.

**١٩٧. میوان لە میوان خۆشی نایێت، ساحێومالّ لە هەردووکیان.**

**١٩٨. مێوە خۆری مایەی شادی و سەرحالّی و لەش ساقی و خۆشحالّی ئینسانە.**

**١٩٩. مالّ زیادە سەر ناشکێنێ.**

**٢٠٠. مشك و عەینەك!.**

***

# پیتی ‹ن›

## پەندی پێشینان

١. نـــان ئـــەخۆی لەگـــەڵ کـــوێرا — خـــوای خـــۆت بنـــە زەڕ بێـــرا

٢. نـابێ مـەئیووس بـی تـۆ لـەم دنیایـە — سـەری بێ ڕۆژی لـە ژێـر خاکایـە

٣. ناخۆم کەلانەو نارۆم لەگەڵ ئەو ڕانە:

خۆشم لێ نایێ و زەحمەت ناکێـشم — پەلاس ئـەپۆشم لایـە هـەورێـشم

٤. نـــارنج و لیمـــۆ خـــەتی شەمـــامە — دڵەکەی تـۆ چـۆنە منـیش هەروامـە

٥. ناخۆشی جوان، وەسە دڵۆپەی بان.

٦. نابێ فەرمانی مەخلووق بەڕێوە ببەی، مادام نافەرمانی خوای تیا بێ. «حەدیسە»

٧. نازانم بڕوا بە قەسەم حەزرەت عەباس بکەم یـا بـە کلـك کەڵەشێرەکە. «کابرایـەك کەڵەشێرێکی دزیوە و قەسەمی بە حەزرەت عـەباس خـواردووە کـە نەیـدزیوە. سـاحێب کەڵەشێرەکەش کە چاوی بە کلك کەڵەشێرەکەوە بووە، ئەمەیە وتووە...»

٨. نـازانـم بـە کـام سـازت هەڵپـەڕم — لە حەنای ئەمرت کە کـوێرو کـەڕم

٩. نازانم، ڕەحەتی گیانم.

١٠. ناتوانم ڕەحەتی گیانم.

١١. نازانم و ناتوانم و نیمە. کەم کەس بتوانێ بیڵێ.

١٢. نازمان هەیە و زۆرمان نیە، لە تۆ نەبێ لە کەس ئینتیزارمان نیە.

١٣. ناعیلاجی حەرام حەلاڵ ئەکات. «بۆیە خواردن، مردارۆ بوو لـە تەنگانەدا حەلاڵە».

١٤. نـافیعـە بـۆ چـاو، ڕافیـعە بۆ ئێش — دیداری دۆستو سیلەی قەوم و خـوێش

١٥. نـالـە ئەگەرچی خـاوەن حەیـوانە — کە بۆ خۆی نابێ، مـەعلووم شـوانە

«نامی»

١٦. نان ئەخۆی بینێ سەر سفرەیێ جوان — مـەینێ باوەشـت هـەروەکـو شـوان

۱۷. نیعمەت حورمەتی زۆرتر لیٚ بگری
بەهرەی زۆرتری لیٚ وەرئەگری
خوا واجبە شوکرو سوپاسی
نایبڕیٚ لە کەس بە ناسوپاسی
سفرەی ڕەحمەتی داخستووە بۆ عام
زۆرتر ئەینێریٚ بۆ گرۆی نەفام
ئیسباتی ئەکا هەر خۆی ڕازقە
بە عەقڵ و شعوور نیە ئەم ڕزقە

۱۸. نان ئەو نانەیە ئیمڕۆ لە خوانە
تازە بیر مەکە لە زووی ئەو خانە

۱۹. نان بێنن بۆ خۆم و جۆ بۆ کەرەکەم
زۆر نامێنمەوە زەحمەت کەم ئەکەم

۲۰. نان بۆ نانەوا و گۆشتیش بۆ قەساو
خەفەت دەرناچیٚ لە دڵ ناحەساو

۲۱. نان بدە بە سەگ، مەیدە بە سپڵە.

۲۲. نان بە تەنیا ناخوریٚ. «ئەبیٚ بەشی فەقیرو هەژارو کرێکارو وەسا کارو میوانی لیٚ بدەی».

۲۳. نان بە ناو چاوە. «هەرکەس بە بەختی خۆی و ناوچاوی خۆی نان ئەخوا».

۲٤. نانت گیرا ئاو، ئاوت گیرا جاو. «لەوەو پێش جاویان ئەکرد بە کفن».

۲۵. نان خۆم و کووزەڵەی کانی، میوانی هەی میوانی.

۲٦. نان گەنم خواردن سك پۆڵاینی ئەویٚ.

۲۷. نان مووسایی بخۆو لە ماڵ گاورا بخەوە، ئەمینی زۆرترە.

۲۸. نان کە گەیی بە ناوکی، نۆکەری گرت بۆ باوکی، کەوا ئەکا بۆ دایکی.

۲۹. نان نان گەنمە و دین دین موحەممەدﷺ

۳۰. نان نانی نانەوایە و ڕوو سووری دیٚ زلێخایە.

۳۱. نان و پیازیش بیٚ و قات و نیازیش بیٚ.

۳۲. نان و دۆ ئەخۆم نان بێدۆ ئەخۆم
ئەو نانە خۆشە لەگەڵ تۆ ئەخۆم

۳۳. نان هەرکەست خوارد سفرەکەی مەدڕە.

۳٤. نان و دۆیش لە وەختی خۆیا خۆشە. «لە گەرمای هاوینا».

۳۵. نان و نیعمەت شوکری کەی، هەر زیاد ئەبیٚ
کوفری نیعمەت کەی هەمووی بەرباد ئەبیٚ

۳٦. نانەجیبە سوار بووە، لۆی لفکەکەی لار بووە، نامەرد بیگرە هار بووە.

٣٧. نانە ڕەقەی ناو دۆڵەکەم نادەم بە پلاوو گۆشت ماڵ هاوسێکەم.

٣٨. نانت جۆیین بێ و خولکت گەنمین بێ.

٣٩. نانێ بخۆو چوار بدە لە ڕێگای خوادا، کە لە مولکی خۆیا جێی تۆی کردووەسۆو ئەوەندە بێ کەلکی.

٤٠. نانێ بخۆو دووان بدە لە سەدەقەی سەر منا. «ئەوەندە بۆ تۆ بە کەلکم».

٤١. نانی سەرمایەداری ئەخوات و جووتەی کمۆنیستی ئەوەشێنێ.

٤٢. ناوجی‌کەر دڵی گوشادە، شەڕکەر دڵی تەنگە. «بەگوێی ناوجی‌کەر بکەن»

٤٣. ناو خۆت لە کوێ بیسەرۆ، لەویا ناو هاوڕێت ئەبەن

ئیتر بیری لێ‌کەرۆ، وەك ئەو خۆت مەکە بە پەن

٤٤. ناوێ گەورە و شارێ وێران.

٤٥. ناوی نابەم، ناوی ئەکەم بە کورکورەی ئاشا.

٤٦. ناهومێد مەبە لە ناکامی تۆ دوای شەوی تاریك، هەر ڕۆژ ئەبێتۆ

٤٧. نمەك بە حەرام مەبە نان و نیعمەت ئەتگرێ

نەگبەت هی ئەو کەسەیە نەسێحەت وەرناگرێ

٤٨. نرخێکە و شاعەباس بڕیویەتەوە. «ئیتر کەم و زیادی نیە».

٤٩. نۆ پیچکە نۆ کەسی ئەوێ، کە چاودێری کاتۆو نەکەوێ. «نۆ پیچکە یانێ منالێ کە تازە کەوتبێتە سەر پێ و جوجۆڵ».

٥٠. نۆکەری بێ بەهرە و بەرات، تاجی سەری ئاغایە بێ زەحمەت و بێ مەینەت بێ ئەرك و بێ غەوغایە

٥١. نۆ لەم هۆزو نۆ لەو هۆز، نۆ لە هۆزی برایمە قۆز، ڕەحمەتیەکەی باوکی تۆش، دەسم وا لە هەویرا، هەر ئەمەم وا لە بیرا. «کچێ پرسی لە دایکی کە لە بیرت بێ چەن شووت کردووە؟ ژنەکەیش ئەمەیە وتووە. دوا جار کچەکە وتی: کامیان باشتر بوون؟ دایکەکە وتی: خوا عەفوویان بکات، هەموویان هەر بۆ بەرۆ ئەهاتن».

٥٢. نووشتەی مەلاکان هەر فڕ و فێڵە ئاخۆم چارەنووس لە شوێن کێ وێڵە

٥٣. نوێژ کە هەمیشە، نوێژ مەفەوتێنە وەزیفەی خۆتە، باش بەجێی بێنە

٥٤. نووشتەیەکم نووسی لەلای مەلا بۆ کوڕەکەم تا گمیز نەکا بە خۆیا، ئێستا گوویشی پێوە ناوێستێ.

٥٥. نوێژ کۆڵەکەی دینە. «حەدیسە. کۆڵەکە ڕوخا، دینیش ئەڕوخێ. وەکو قورئان ئەفەرمێ: ئەو پیاو چاك و نوێژکەرانە لە دوای خۆیان ئەولادێکیان جێ هێشت کە حوکمی نوێژیان زایە کرد یا هەر نەیانکرد یا دەسووریان بە جێ نەهانی و کەوتنە شوێن هەوەس بازی، دوای ئەوە ئەکەونە ناو گومڕاهی. سوورەی مریەم، ئایەتی ٦٠».

٥٦. نوێژ کەری نوورینی، فرمان کەری شیرینی.

٥٧. نوێژ کە میعراجی موسوڵمانە — با تۆش چیتە ناو ڕیزی ئەوانە
«إِیَّاكَ نَعْبُدُ» ئەڵێ بە پیوە — سەلام لە حەزرەت ئەکەی لە جێوە
وتو وێژ ئەکەی لەگەڵ خوای خۆت — چیرۆك ئەگێڕی لە بۆ میعراج خۆت

٥٨. نوێژ مەنعی ئینسان ئەکا لە گوناح و خراپ‌کاری. هەرکەس زۆرتر لە نوێژ تەئسیری وەرگرتبێ، گوناحی کەمتر ئەکات.

٥٩. نوێژ میعراجی موسوڵمانە. «حەدیسە. کە ئەچنە حوزووری خواو وت و وێژی لەگەڵ ئەکەن و فاتیحا ئەخوێنن، ماناکەی بە کوردی و کورتی ئەمەیە:

بە ناوی خوای بەخشەندە و میهرەبان ✿ سوپاس بۆ خوای بەخێوکەری هەموو عالەم ✿ بەخشەندە و میهرەبان ✿ خاوەنی ڕۆژی جەزا ✿ هەر بۆ تۆ عیبادەت ئەکەین ✿ هەر لە تۆ داوای یارمەتی ئەکەین ✿ هیدایەتمان بدە بۆ ڕێگەی ڕاس ✿ ڕێگەی ئەوانە کە نیعمەتت پێداون، نەك ڕێگەی ئەوانە غەزەبت لێ گرتوون و نە ڕێگەی ئەوانە کە گومڕا بوون ✿ ئامین، خوا قبوڵی بکەی لێمان.

٦٠. نوێژی مەغریب وەسە فرۆی سەر ئاور، زوو نەچی بە دەمیۆ بەسەر ئەچێ.

٦١. نە ئەونە زۆر خۆ لە دەمت بێتۆ — نە ئەونە کەم خۆ دڵت بووریتۆ
ئەمە ئەنازەی خواردن ئەسحاب بوو — بۆیە ئیحتیاجیان بە دوکتۆر نەبوو

«حاکمێك لە زەمانی پێغەمبەرﷺ دوکتۆرێکی زۆر چاکی نارد بۆ لای ئەسحابەکان کە دەوایان بکات. دوو ساڵ لەوێ بوو و کەس لێی نەپرسی. لە خزمەت حەزرەتا گلەیی کرد کە کەسێ لێم

ناپرسیّ. فەرمووی: ئەسحابی من تا تـەواو برسـی‌یـان نـەبیّ خـواردن نـاخۆن و وەخـتیّ خواردن ئەخۆن تێر ناخۆن و دەس ئەگرنۆ، بۆیە نەخۆش ناکەون و نایێن بۆلای تۆ»:

سەبرو خۆگری و شەکیبایی خۆت بکـە بـە دەوای بیّ نـەوایـی خـۆت

٦٢. نە بۆ سەیر باشی، نە بۆ زەمـــاوەن ئەی بۆ چی خاسی، باوەحیز خـاوەن

٦٣. نە ئەوەندە شیرین بە، بتخۆن، نە ئەوەندە تاڵ بە تفت بکەنۆ.

٦٤. نەبوونی ڕووی مووسکی ڕەش بیّ. «مووسك: دێیێکە لە نزیکی مەریوان، عادەتەن ماس فرۆشن، ڕۆژیّ یەکیّ لـە مـەریوانا ماسـی نـابیّ بیخـوات و ئـەڵیّ نـەبوونی ڕووی مووسکی ڕەش بیّ. ئەمە دەماودەم کەوتوە و زۆرکەس ئەیلێن».

٦٥. نەبوونی دەویتی نیە تا ئابڕووی ئینسانی پیّ برِوا.

٦٦. نەبوونی سەر بە ماڵ دوژمنا ئەکا. ئەگەرنا تۆپین باشترە لە کۆپین.

٦٧. نەبوونی هیچی لەگەڵ ناکریّ، ئازای چۆنەریّ لەناو مشتما هەڵکەنە.

٦٨. نە بە سوێندی ژن بڕوا بکە، نە بە پێکەنین حاکم.

٦٩. نە بە بەرخی، تێر شیری خواردووە، نە بە کاوڕی، تێر گیای خواردووە.

٧٠. نـەجاتی زوکـام وا بـە نـەبـاتـۆ بـە نـەباتداخـی، خۆشـت ئـەکاتۆ

٧١. نەچێـر لە کـەژو لە کێوی خۆمان هیچ سەگیّ نایگریّ مەر سەگی خۆمان

٧٢. نەجیب خەتا ناکا، نانەجیب وەفا ناکا.

٧٣. نەخشینی بیّ پۆشین ساکاری شەدەلاری. «پیاوێك دوو ژنی بوو، یەکیّ نەخـشین و بیّ پۆشین یەکیّ ساکار و شەدەلار».

٧٤. نەخۆش حەز لە هەرچی بکا، بۆی پەیا بکەن، ئەوە دەوایەسی.

٧٥. نەخۆشی بۆ پیـر، وەسە ڕەشی قیـر لە کـۆڵ نـابێتۆ تـا ئەیــخاتە گیــر

٧٦. نەخۆش عەقڵ و فکریشی نەخۆشە.

٧٧. نەخۆشی جوانان وەسە دڵۆپەی بانان، زوو ئەگرسێتۆ.

٧٨. نەخۆشی تا سەر بۆ کەسیّ نامێنیّ، نابیّ بەشەر بەدەسیۆ بناڵێت و دامێنیّ.

٧٩. نـە دوو مـایـن لە دۆڵـیّ نە دوو ژن لـەسەر کەمۆڵیّ

٨٠. نە دەرزیم بشکێم، نە ئاوم بچم بە عەرزا، نازانم لە تەریقی خۆما چی بکەم.

۸۱. نـە دەمـم هـەیـە و نـە دەس نە دەم ئەکەمۆ لە کـەس، نـە دەس

۸۲. هـەرکەس دەمم لێ کاتـۆ یا دەس حەواڵـەی ئەکەم بە کەسی بێ کەس

۸۳. نەدی و بدی کورێکیان دی، کێرو گونیان بڕی. وتیان ئەمە مۆجزەیە.

۸٤. نە ڕۆژم ڕۆژە و نە شـەوم شـەوە نە خـەوم هەیـە بـەم نیوە شـەوە

دایـم ئـەناڵـم بـە دەم دەردەوە دایـم وام بـە ڕێـی هـەردو بـەردەوە

۸۵. نـەزان چـووزانێ زانـا چی ئـەکا لە ڕووی زانینۆ هەرچـی کـا ئـەیکا

۸٦. نـەزان ئێـمـەین و زانـا خـوایـە هـەموو کارێکمـان لـە دەس ئەوایـە

۸۷. نـەزان چـووزانـێ بـە بێ خەبەری زانـا چـی ئـەکا تۆ بـێ خـەبـەری

۸۸. نـەزان چـووزانێ لـە بیـروونـەوە من کوێم دەرد ئەکا لـە دەروونـەوە

۸۹. نەزان مناڵـە و هـەر گـەورە نـابێ هـەتاکوو عـەقڵی وەك منـاڵ وابـێ

۹۰. نـەزرم کـردووە لـە سـەر خـۆم کـە ئیتـر خـەفەت نـەخۆم

لـە ڕابـردوو تۆبـە کـەم بـۆ داهـاتـوو سەبـر کـەم

۹۱. نەقڵی کوفر، کوفر نیە.

۹۲. نەزەر بۆیـە حـەرامـە، ئینسان دڵـداری نـەکا

خۆی تووشی دەردی سەخت و کاری بێکاری نەکا

۹۳. نەزەری گەورەکان کیمیایە، خۆت خە بەر نەزەریان، دانیشە لە گوزەریان.

۹٤ نەسێحەت هەرکەسێکت کرد بەر لە هەموو کەسێ هی خۆت بکە با تەئسیر بکات.

۹۵. نە شێت ژیر ئەبێ و نە حیز پیر ئەبێ نـە پیـاوی عاقـڵ بێ تـەگبیـر ئـەبێ

۹٦. نە شێخ نە مـەلا ئـەڵا و ئێـوەڵا دڵ ئـازاریـان ئـەبـێ بـە بـەڵا

ژن و ژن خـوازی مەکە لەگەڵیان با خزمەتکار بـی بۆ هـۆزو گـەلیان

۹۷. نەگبەتی ئەگەر شاخ و گوێی بوایێ ئەبـوا زۆر بەشەر بـێ بـەش نـەبوایێ

۹۸. نەگبەتی باشە، قۆرتی خـراوە.

«مەسەلەن بێکاری نەگبەتیە و ئەرك خۆ قورس کردن قۆرتەکەیەسی».

۹۹. نەگبەتی ئەسوورێتۆ وەکوو داڵ بەسـەر ئـەو خێزان و مـاڵ کـە دوور لـە خـوداو ناڕاستن.

۱۰۰. نەگبەتی ڕووی کردە ماڵێ و پرسی کرد بە ساحێو ماڵەکە کە ئەمەوێ شتێکتان تووش بکەم تۆ ئەڵێی چی؟ وتی: کە ناچار بم ئەڵێیم: هەر ئاژاولەمان تێ نەخەی هەرچی مەیلت هەیە بیکە.

۱۰۱. نەگبەتی وەختێ ڕوو کاتە کەسێ — هەرکەس هەڵئەسێ پیایا ئەتسێ
وەختێ خۆشبەختی ڕووی کردە کەسێ — دەس و دەم هەموو دوژمن ئەبەسێ

۱۰۲. نەگبەتی هەروەکوو داڵ بەسەرمائەسوورێتۆ — دنیا لەلام تاریکە هەموو ساتێ بە بێ تۆ

۱۰۳. نە ماڵی هەس ڕەحمان بیبا — نە دینی هەس شەیتان بیبا

۱۰٤. نە نووشتەی مەلا نە دۆعای سەیی — هیچیان بە هاوار دڵمان نەگەیی

۱۰۵. نە گوڵی گەنمی دیوە و نە چەقەنەی ئاش. «واتە: فڵانە کەس نانی بێ زەحمەتی خواردووە».

۱۰٦. نە نە! وا لە لای چۆڕا. «کەسێك کە هەرچێکی پێ بلێن و بلێ نە، پێی ئەڵێن نە نە وا لەلای چۆڕا. چۆڕ: دێیێکە لە ناوچەی مەریوان».

۱۰۷. نەورۆزو گوڵان، مانگی جۆزەردان — پرووش پەڕ، خەرمانان، گەلاوێژی جوان
ڕەزبەر، گەڵاڕێز، سەرماوەز بە نام — بەفرانبار، ڕێبەند، ڕەشەمە ئەنجام

«دوانزدە مانگەی ساڵ بە وتەی مامۆستا نامی. بەڵام برێك لە زانایان ئەفەرموون «گەلاوێژ» وا لە دوای «خەرمانان» وە».

۱۰۸. نەوس بیگری مشتێکە — بەری بەیتۆ، دەشتێکە

۱۰۹. نۆکەر لە خوا بترسێ وەك لە ئاغا ئەترسێ، مەلەکی ئاسمان لە گوناحی نەترسێ.

۱۱۰. نیشانەی قبووڵ بوونی حەج ئەوەیە کە حاجی لە جاران باشتر بێ، کە خراوتر بوو مەردوودە.

«دەسەیەك جەردە چوونە ڕێی ڕێبوارێ و ڕووتیان کردۆ. یەکێکیان دەرپێکەی پێ داکەند هەرچی پاڕاوە بۆ دەرپێکەی سوودی نەبوو. ئاخری وتی حاجی تۆ ئەو مەکە زیارەتت کردووە واز لە دەرپێکەم بێنە. وتی: جا تۆ چووزانی من چوومەتە مەکە. وتی: بە بێ ئینسافییەکەتا ئەزانم!».

۱۱۱. نیکاح دانرا بۆ کۆ بوونەوەی... — ژنێك و پیاوێ، بێ دەنگ و بێ وەی
شاهید ئەم بەیتە ئاشکرا ئەکا — حەڵاڵن بە یەك کەس هەرا نەکا

تـەڵاق دانراوە بۆ جیایی و فیراق | کە تـەڵاقت دا مەیکـە بـە مـەراق
هیچ حیلەی شەرعی بۆ مەدۆزەرۆ | بـە داخی زووتر بـیری لـێ کـەرۆ

۱۱۲. نیوە تێری لـە برا مردن خراپترە. «یا تێرم کە یا فێرم کە».

۱۱۳. نیوە مەلادین لا ئەباو نیوە دوکتۆرگیان.

۱۱٤. نیـوە مـەلایی و نیوە دوکتـەری | مونکیری ئەوان، سەر مـەنێ سـەری
تەواو مەلایی و تەواو دوکتـەری | بـە سەر عـالـەما هـەسیان بەرتەری

«نـیـوە مـەلایـی»

مــەبـە بـە کـۆلـکـە مـەلا | چـیـتـە دێـیێ مـەسـەلا
دەس کـەی بـە فـتـوای ناحـەق | لادەی تـۆ لـە ڕێـگـای حـەق
نووشتـەی سێ سووچ بنـووسـی | بـۆ دڵـداری و عـەرووسـی
دنـیـا ئـەرزشـی نـیـە | فـرو فـێـڵـی بـۆ چیـە
وەرگـرتـنـی بـەراتـت | خـوا بـیخـا بـە مـیـراتـت
کـەم بـخـۆو کـز دانـیـشـە | ئـاسـوودە بـە هـەمـیشـە

«نـیـوە دوکـتـۆری»

مـەبـە بـە کـولـکـە دوکتـەر | مـەتـەب دانـێیت و دەفـتـەر
کـابـرای نـەخـۆش و فـەقـیـر | بـێ مـاڵ و حـاڵ و زویـر
تـۆ دوکـتـۆری نـازانـی | بـۆ بـەر بـوویـتـەسـە گیـانـی
واز بـێـنـە بـا خـۆی بـمرێ | نـەك بـە دەوای تـۆ بـمـرێ
قـەتـڵی نـاحـەقـی مـەکـە | خـۆت ڕیسوای لای حەق مەکە

۱۱٥. نیەتمە ئەکێشم ئاوی گۆشم لـە سەرە مەرگا، ناوی خواو پێغەمبەر نەچێ لـە هۆشم.
«هەورامی لـەکاتی دەسنوێژدا کە مەسحی گوێچکە ئەکێشن، وا ئەڵێن».

۱۱٦. نیەتم هێناو نوێژم نـەکرد، نوێـژم کـردو نیـەتم نـەهێنا. «کەسـێ دوای ڕکـووعی دووهەم نیەت دوو ڕکات جومعە بێنێ لە پشت سـەر ئیمـام جومعـەوە و ئیمـام سـەلامی داوۆ، مەئموم هەڵئەسێ و چوار ڕکات نیوەڕۆ ئەکات بێ ئەمە نیەتی هێنابێ».

۱۱٦. نیە لـە ماڵیا شێوی شەوێ | گـووارەی ئـاڵتوونی ئەوێ

۱۱۷. نانش بە گۆشێ ژاوان!

***

# پیتی <و>

## پەندی پێشینان

١. وا ئەزانیٚ هێلکەی دوو زەردێنەی بۆ کردووین، «ئەوەندە فیز ئەکا بە سەرمانا».

٢. واتە لیٚ ئەکات بە کەر بلێی خالۆ — بە مەوج و بەرماڵ بتبەنە مالۆ

٣. واران وارۆ پەی خەڵەی — گیواو بزیۆ پەی گەڵەی

«دۆعای بارانی منالە هەورامییەکانە»

٤. وا ئەزانیٚ ئەملای ناوە بەولاوە. «ئەونە فیز ئەکا بە سەرمانە»

٥. وا ساڵیٚ گا گووی نەکرد، ئێوە چی ئەکەن. «نەفەریٚ خەڵکی وڵاتی دارستان دار چووە دێی لەیلاخ بە تایە تەپاڵەیان هەڵچنی بوو. وتی: ئەمەتانە بۆچیە، وتیان تەپاڵە سووتەمەنی زستانمانە. وتی: دەی وا ساڵیٚ گا گووی نەکرد، ئێوە چی ئەکەن!؟».

٦. واڵیٚ مەگێرە بەهانیٚ — هەڵوا مەکیش مەبیانیٚ

«واتە: خۆشکە مەگرە بەهانە، هەڵوا خوێی ناویٚ. هەورامی وا ئەڵیٚ».

٧. وایان داناوە پیاوانی دانا — کۆسە چوو بۆ ڕیش سمێڵیشی دانا

تەماع چی ناورد بەسەر ئینسانا — کۆسە بۆ ڕیش چوو سمێڵیشی دانا

٨. وتن ئەگەر خۆی نوقرەیە، نەوتن تەلایە — چوون وتن باعیس دەردو بەلایە

٩. وتیان بە بالولی دانا: بۆچی لە بەرچاو خەڵکا خۆت بە شێت ئەنوێنی؟ وتی: بۆ ئەوە وا ئەکەم کە هەرچی لە دڵما هەیە بتوانم بەیانی بکەم و کەس ئیرادم لیٚ نەگریٚ.

١٠. وتیان بە پشیلە: گووت بۆ دەرمان ئەشیٚ، ڕۆیوو کردی بە ژێر خاکەوە.

١١. وتیان بە پیاویٚ: دەولەمەنی؟ وتی: کوڕم هەیە. وتیان: نانتان هەیە؟ وتی: کۆڵە بەسم هەیە و ئاوەینام هەیە.

١٢. وتیان بە خووگ: بۆچی بە ڕۆژا دیار نیت؟ وتی: لەترسی خراپی و کردەوەی شەوم ناوێرم بە ڕۆژا دەرکەوم.

١٣. وتیان بە کەروێشك: بۆچی تۆ لە تانجی زۆرتر ڕا ئەکەی؟ وتی: من بۆ نەجاتی خۆم

ڕا ئەکەم، ئەو بۆ تەماى ساحێوەکەى.

١٤. وتیان بە ڕێوى کێ شاهێدتە؟ وتى: کلکم.

١٥. وتیان بە شەیتان تۆ بەو هەموو سوورەتە جوانۆ، بۆچی باشت نالێن؟ وتی: مەگەر قەلەم بە دەس دوژمنۆ نیە!؟. «کشف‌الّسرار»

١٦. وتیان بە شەیتان تۆ کێت خۆش ئەوێ، وتى دەلاّلم زۆر زۆر خۆش ئەوێ من درۆ کردنم فێر کردووە، ئەو سوێندیشى لە سەر ئەخوات.

١٧. وتیان بە شەیتان تۆ کێت خۆش ئەوێ | وتى قەتارچیم هەر زۆر خۆش ئەوێ
نە ئەهلى نوێژە، نە پارێز ئەکا | هەرچى پێ بلێم بەڕێوەى ئەبا

١٨. وتیان بە قرژانگ: بۆچی بە لارۆ ئەڕۆى؟ وتى: بۆ جوانان هیچ عەیب نیە.

١٩. وتیان بە کابرایەك: مریشك چەن پەراسووى هەیە؟ وتى: لە ئەمنیەى زەمان ڕەزا شا بپرسن.

٢٠. وتیان فلاّنى قورئان خوێنێ باشە. وتیان: قورئان خوێن بوایێت بەسەر قەبرى باوکیۆ قورئانى ئەخوێند.

٢١. وتیان بە کوێر: چیت ئەوێ. وتى: دوو چاوى ساق.

٢٢. وتیان بە کەچەڵ: شایى خۆشە یا شیوەن؟ وتى: هەرکامیان چێشت و گۆشتى زۆرتر بێ.

٢٣. وتیان بە کەر، کرماج، لە داخا حەوت ڕۆژ جۆى نەخوارد.

٢٤. وتیان بە کەروێشك بۆچی ڕا ئەکەیت و لا ئەکەیتۆ؟ وتى: بۆ دووربینى دوایى وا ئەکەم.

٢٥. وتیان بە کیسەڵ: زەماوەنە، وتى: نە دەس و دەم پلاّو خواردنم هەیە و نە پاى هەڵپەڕکێ.

٢٦. وتیان بە گورگ: نۆرە ڕانتە. وتى: پام کوتیاوە، لە خۆشیا بڕواى نەئەکرد.

٢٧. وتیان بە لوقمان حەکیم: کەسێ گوێچکەى بخورێت بە چى بیخورێنێ؟ وتى: بە ئەنیشکى.

٢٨. وتیان: ناچێتۆ بۆ گوێی. وتی: دەی نەیخورێنێ.

٢٩. وتیان بە مامۆسایەکی زۆر چاك: بۆ مۆجگاریمان ناکەی؟ وتی: ئەگەر ئەوە بلێم ئێوە پێتان خۆشە، خوام لێ ئەرەنجێ و ئەگەر ئەوە بلێم کە خوا پێی خۆشە، ئێوەم لێ ئەرەنجن، بێدەنگ بم باشە با کەسم لێ نەرەنجێ.

٣٠. وتیان بە منالێ: سەر شووتیە کۆلە، دەسی کردە گریان و وتی: شوتی ئەخۆم.

٣١. وتیان بە مەلای مەزبووره بۆچی؟ مەلا ژن ئەونە ئەگەڕێ تۆ چی؟:

وتی: مەلا ژن ئەر زۆر گەڕایێ ڕێی ئەکەوتە لام هەر ڕۆژێ ڕایێ

٣٢. وتیان بە مەلای مەزبووره: مەلاژن زۆر ئەگەڕێ. وتی: مەلاژن زۆر گەڕایێ ڕۆژێ رایێ ئەهاتۆ بۆ ماڵ خۆمان.

٣٣. وتیان بە مەولەوی کورد «اعوذ بالله» فەرزە یا سوننەتە؟ وتی: فەرزە. وتیان: خۆ سوننەتە بۆچی وات وت؟ وتی: بموتایێ سوننەتە فاتیحاکەیان پێوە ئەخوارد. «جۆرێکی‌تر ئەیگێڕنەوە کە جارێك پیاوێك وتی بە مەولەوی کورد: «ئامین» فەرزە یان سوننەتە؟ وتی: فەرزە. کابرا ڕۆیشت و ئەوانەی وا بە دەوریا بوون وتیان: قوربان ئامین کەی فەرزە، سوننەتە، بۆچ وا وەڵامی ئەو کابرایەت داوە؟ ئەویش وتی: ئێوە عەوام ناناسن، ئەگەر بموتایە سوننەتە «ولاالضّالّین»ەکەیشیان پێوە ئەخوارد».

٣٤. وتیان بە نەرگس بۆچی بۆن خۆشی وتی: کەوتوومە بەهارو خۆشی

٣٥. وتیان بە ورچ: کوێنەریت؟ وتی: ئەوێهەنگیم. «ئەشرافی سنەیی وتیان بە مەلا محەممەد سادقی ئەوێهەنگی: بۆچی ورچ وائەڵێ؟ وتی: ئەوێهەنگی ئازان، وا نەڵێ تەمای تێ ئەکەن. ئەوێهەنگ: دێیێکە لە هەورامانی ژاوەرۆ».

٣٦. وتیان بە وشتر: کوڕت بووە. وتی: جا بە من چی، خۆ باری من هەر چل مەنە.

٣٧. وتیان: فلانە کەس کەرە و بەکار کوێخایی نایێ. وتیان، کەر نەبێ نایکاو کەر نەبێ نایکەن.

٣٨. وتیان: فلانە کەس مرد. یەکێ وتی: گووم بە قەوری. یەکێکتر وتی: من هەر دوێکە وتم. یەکێکیتریش وتی: سەگێ لە سەگەکان کەمتر. «تۆ کارێ مەکە واتە پێ بلێین».

٣٩. ورچ بێکار بێ، تووکی خۆی ئەرنێتۆ. «بێکاری ئەوەندە خراپە».

٤٠. ورچ بێ و کچ بێ. «پیاو ژن بێنێ وا ئەڵێ، ژنیش شوو بکا ئەڵێ: شێت بێ و هار بێ، هەر هەرزەکار بێ».

٤١. ورچ لە هێلانەی خۆیا دەنگ ناکا	لە حەنای میوان ئەونە شەرم ئەکا

«تۆیش وا بە».

٤٢. ورچ و کولنجە!، بینێ بەر چاوت چەنێ سەیرە.

٤٣. وردەلە وردەلەی گوێی کوانوو	وردەلە خۆش بێ بۆ بیانوو

«ژن بە منالی وا ئەڵێ»

٤٤. وەڕەی سەگ ئینسان هۆشیار ئەکاتۆ بە شەوا بۆ هاتنی میوان یا دز.

٤٥. وشتر ئاخر تۆ لە عەلاقەبەنیت چی؟.

٤٦. وشتر لە خەیاڵێ و وشترەوان لە خەیاڵێ.

٤٧. وەسیەت نامەت بێ نەچیتە هەوار	هەتاکوو ئەڕوا سێ شەش و سێ

٤٨. وڵات لە هەی هەیە و کۆسە بەڵمەڕیش

چوار کەی ئەمە کارە و کەی بووە بە ئیش

٤٩. وەختێ بەفر زۆر ئەبارێ خەڵك بە یەکتر ئەڵێن خوا موڵکی خۆیەتی با بباری، وەختێ کە عەرزەکە ڕەش ئەبێتۆ، لەسەر بۆسێکی چەن بەزم و هەرا ئەکرێ.

٥٠. وەختێ دەس بڕا لە هەموو لایە	نۆرەی ڕەحمەتی حەق تەعالایە
پیر دەسی بڕا لە هەموو لایێ	خوا نەبێ کەستر بەکاری نایێ

٥١. وەختێ قەسد ئەکەی بچی بۆ سەفەر	ڕەفێق پەیا کە و بڕۆ بێ خەتەر
ڕەفێق سیان بن یا بن بە چوار	زۆر چاکە ئیتر بۆ هاناو هاوار
یەکێکیان ڕۆیی بۆ بردن هاوار	ئەوان دانیشن لای نەخۆشیدار

٥٢. وەختێ قەسد ئەکەی لە ماڵ چیتە دەر	بیکە دوو ڕکات نوێژی سەفەر
لە ڕکات ئەوەڵ سوورەی «فیل» خوێنە	لە ڕکات دووهەم «قورەیش» بخوێنە
ئەڕۆیت و دیتۆ بە شادی و خۆشی	بە بێ زەرەرو دەردو نەخۆشی

٥٣. وەختێ کە بەشێ ئەعزات بێتە ئێش	باقی ئەعزاکان بۆ ئەو دێتە ئێش
تۆ کە لە مەینەت خەڵك بێ خەبەری	کەی وایە ڕەسم و یاسای بەشەری

٥٤. وەختی کەڵك و کار ئەمانکا بە یار — وەختـی جـزو بـۆ ئـەمانکا بـە دز
٥٥. وەخـتێ کە مردن چنگی هـەڵپێکا — هیچ نووشتـە و دەوا عیلاجـی ناکـا
پێش موبتەلاّ بوون بە چنگی مردن — دۆعـا تەئسیـری هەیـە بـۆ کـردن
٥٦. وەختێ گەیشتی بە کول مـورادت — هیـچکەس نـامێنی لـە بـیرو یـادت
٥٧. وەختێ لاشەکەم کووفتە و کارە بێ — نـووری بینـاییـم لـێ بێـزار ئـەبێ
٥٨. وەسـای قـوتابی چلیان جـۆلایێ — چـل جـۆلاّ ژنی بێ عـەقلێ و ڕایـێ
هەرچەن ئوستادی خێری تەمامـەن — ئێـمە قـسـەمان لـە عـەقلێ و فامـەن

«نامی»

٥٩. وەختێ کە ماسیت خوارد، شیر مەخۆ بە سەریا با تووشی بەڵەکی نەبی.

٦٠. وەسە بازەکەی ماڵ عەتاخان، بە مریشك ئاوایی فێرە. «عەتاخان خۆیشی لە زووەوە واسە، بۆیە بازەکەشی هەر وەهایە».

٦١. وەسە پشیلە، بەچکەکەی بە چاو نەکراوەیی ئەباتە حەوت ماڵ.

٦٢. وەسە سەگی پێ سووتاو، هەر ناکەوێتە ماڵێ.

٦٣. وەسە کۆپانەکەی جەجاڵ هەر ئەیدووڕێت و مێلوورە هەڵیئەوەشێنێ.

٦٤. وەسە گاکەی مامە حاجی، لە جووت خۆیانا ئەخەوێ و لە جووت خەڵکا خێرایە.

٦٥. وەسە نان و نۆك بخوا، ئەونە ناخۆشی پێ ئەکەوێ.

٦٦. وەعزیمـن بـۆ ئـەهلی میللـەت چاوەکەم — پووچ و بێ تەئسیرە وەك تەڵقینی جـۆ

«ناری»

٦٧. وەفا بۆخۆی گـوڵێکی بێ نەزیـرە — وەفا ئیسباتی پـاکی نەسـڵی شیـرە
٦٨. وەفـا هەروەکـوو عەنقا وەهـایـە — هەر ناوی هەیـە و بـێ موسەمـمایە
٦٩. وەك چاوی قرژانگ ڕۆشن و پاکە — نەك مـن، عالـەمێ لـەبۆی هیلاکـە
٧٠. وەك دۆخەوای شێت وا مای هاتووەتۆ — کەس ڕێـی پـێ نـابا، نە من و نە تۆ

٧١. وەك سەوەتەی بەن بڕاو داکەوتووە لە ماڵێ
هیچ کارێکی لێ نایێ هەر وا ئەڵێ لە پاڵێ
لەبەر دەرگا تووڕی دەی کەسێ نایباتە ماڵێ

۷۲. وەکو چێشتی مـجێور وایە، تێکەڵە لە هەموو جۆرێ. «لـەوەو پـێش لـە جێـژنی ڕەمەزان و قوربانەدا لـە هەموو ماڵێکۆ نان و چێشتیان ئەهانی بۆ مزگەوت و بە جەماوەری ئەیانخواردو هەرچێکی ئەماوە ئەیاندا بـە مـجێور (خـادمی مزگـەوت) و بەمیانـە ئـەوت چێشتی مـجێور، کە لە هەموو جۆرێ تێکەڵ بوو».

۷۳. وەکو خوم مای یێنمۆ، ئەونە ئەم شارە ئەشڵەقێنمۆ بە یەکا. «زووتر لەم وڵاتـا کـە تەونیان ئەکرد، بۆ ڕەنگ کردنی وەسڵە لە هەموو دێیەکا خومگەر ڕەنگی ئەکرد».

۷٤. وەك هەسان چۆنە بۆ تێخ، تیژی ئـەکا — ژن بـۆ پیاو وایە، کـرژو تیژی ئـەکا
ژن بـێنن هـەتـا دەوڵەمـەنـد ببـن — لە ژیـانا خـۆتـان سـەربـەخـۆ ببـن
زەحـمەت بکێشە بۆ ڕێکی ماڵـت — لـەبـۆ سـەربـەرزی ماڵ و منـاڵـت
بە کـۆمەکی ژن مـاڵداری ئەکرێ — ژن کۆی نەکاتۆ هیچت بۆ نـاکـرێ

۷٥. وەك هێسر هەجیجی خۆشەویستە، لە توورەکە ئەخوات و لە ئاخوڕیش.

۷٦. وەنـەوشـە مـلی لارە لە حـەنـات — خەجاڵەت ئەیگرێ بۆنی بێ لـەلات
لەبۆ سەر ئـێشـە وشکی دەوایـە — بـیکە نـاو ئـاو گـەرم لە زووۆ وایـە

«مامۆستا عبد الکریمی مودەڕڕیس "نامی" بۆ حەزرەتﷺ بەم جۆرەیە نووسیوە:
وەنەوشەی باخان چونکە بە شەرمە — لە نـاو گـوڵانـا شـۆرەتی گـەرمـە
بە تـەڕی بەستەی دەستـی دڵبـەرە — بـە وشـکی دەوای ئـازاری سـەرە
وەنەوشە و نەرگس عەتری حەزرەتە — بۆ زیـارەتـی ئـەو زۆر بە عـەزرەتـە

۷۷. وەها بمرە کە هەروەخت مردی قەوم و کەست بۆت بگریێن و تۆ پێکەنی. «واتە: بە ڕووسووری بمری. نەك تۆ دوای مردنت لە عەزابا بیت و بگریت، بـەڵام خـەڵکی پـێ بکەنن کە تۆ مردویت و نەجاتیان بووە لە دەستت!».

۷۸. وەها عیبادەت بکە بۆخوا وا بزانە چاوت وا لە خواوە. تۆ چـاوت لـەو نـەبێ ئـەو چاوی وا بە تۆوە. «حەدیسە».

۷۹. وەها کار بکە بۆ دین وا بزانە سۆزی ئەمری. وەها کار بکە بۆ دنیا وا بزانە مـردن هەر نیە. «حەدیسە. واتە: با هەردوو کارەکەت مەحکەم بێت».

۸۰. وەهای فـەرمووە حەزرەتی ڕەئـیس — نەزەر تیرێکە لـە تـیری ئیبـلیـس

چەن کەسی کوشتووە بە دەردی جگەر    چەن‌کەس وەك مەجنوون دەشتی‌گرتە بەر

٨١. ویتە ویتی تەواو بوو.

٨٢. وەشلێم پەنەت. «خۆزگەم بەخۆت وا ئەونە بێ خەمی. هەورامییە».

٨٣. وێم و زارۆڵەکەما وەشێ بیمێ، ڕیش و تاتە و ئومـەت و موحەممـەدی. «نەفـەرێ هەورامی وای وتووە و مانای ئەوەیە کە: خۆم و منالەکانم خـۆش بـین، بـە ڕیـش بـاوك ئوممەتی پێغەمبەر».

***

# پیتی <٥>

## پەندی پێشینان

١. هات بخەوە، نەهات بخەوە. «هات بێ خەم بخەوە، نەهات بە داخ و خەفەتۆ بخەوە».

٢. هارونە ڕشید بە بالۆلی برای کە دەروێش مەسلەك بوو، وتی: خەم مەخۆ من جیرەیەکت بۆ ئەبڕمۆ کە تەئمینی ژیانت بکات. بالۆل وتی: من جیرەی کەسێکم ئەوێ کە ئەم سیفەتانەی تیا بێ. (١: بزانێ کە من نیازم بە چەنێ هەیە. (٢: بزانێ لە چ وەختێکا من ئیحتیاجم هەیە. (٣: بزانێ لە چ شوێنێکا ئیحتیاجم هەیە و بۆمی بنێرێ. (٤: بە بۆن نافەرمانی منۆ جیرەکەم نەبڕێ. ئەو کەسیشە تەنیا خوایە. «مەعنای تەوەککول ئەمەیە کە بالۆل بوویەتی».

٣. هالاوێ لە پلاوێ خۆشترە. «لە سەرمای زستانا وا ئەلێن»

٤. هالە ڕۆیی هەنگوور ما سەربەرزی باخەوان ما

٥. هاوار بۆ ئەو کەسە کە فیرعەون پێی بلێ کافر.

٦. هاوڕەنگ و هاودەنگ جەماعەت نەبی ڕیسوای ناو کۆڕی جەماعەت ئەبی

٧. هاوڕێ لە ڕێت نەوێسا، دانیشە با ئەو بڕوا کە ئەو بە خەم تۆ نیە، تۆیش بە ئەو مەکە بڕوا

٨. هاوینە ئاوێنە.

٩. هاو زاوا بگەن بە یەك قنگیان ئەخورێ. «وا دیارە لە سەر خەسوویان کە بە جووتە گا دانراوە شەڕ بکەن».

١٠. هاوسێ وەزەنی خراوە مەیکە، «هەرچی ئەزانی خراوە مەیکە».

١١. هەباسە، لە دیوانا چ باسە. «کوڕێ ناوی هەباس بوو لە دیوانی حکوومەتیا بوو و هەر ڕۆژ کە ئەهاتۆ دایکی ئەیوت: هەباسە لە دیوانا چ باسە. کوڕەکە پرسی کرد بە پیاوێ ژیرو وتی جوابی دایکم چۆن بەمۆ؟ وتی: بلێ حکوومەتی وەخت دەستووری داوە

هەر پیرەژنێك پڕ بێژنگێ کا بتوانێ هەڵگرێ ئەبێ شوو بکات. کوڕەیش ئەمەی وت بە دایکی. پیرە ژنەکە تەمای کردە خۆی و وتی: ڕۆڵە بزانە منیش ئەیتوانم. کوڕەکە ڕۆیشت و گاسنێکی خستە ناو بێژنگ و کای کرد بە سەریا و
بۆی هانی. بە کێشەکێشیش هەرجۆری بوو بەرزی کردەوە و وتی: هەباسە کێشە کێشیشی هەر خاسە. وتی: دایە گیان شوکر تۆیش بەرزی ئەکەیتۆ، بەشکو فکرێکت بۆ بکەین».

١٢. هەتا پووڵت لە بیر بێ، خوات بیر ناکەوێتۆ
خۆزگەم بەو کەسە هەرگیز پووڵی بیر ناکەوێتۆ

١٣. هەتا زۆرترت بێ، خەمت زۆرترە و بارت قورس‌ترە. بۆیە وتوویانە کەر کوڵ و بار سووك.

١٤. هەرچێکمان پێ‌کات ساحێودەسەڵات
ئەبێ پارێنۆ خراپتر نەکات

١٥. هەر پەلێکم وا بە دەس ئێزرائیلێکۆ
ئەونە نەخۆشم لە بۆ دووری تۆ

١٦. هەر جۆرت کردووە زووتر، وا مەکە
بڕوا بە دنیای بێ وەفا مەکە
وەفای بۆ کەسێ نەبووە و هەر نابێ
بۆ خەڵك چۆن بووە، بۆ تۆش وا ئەبێ

١٧. هەرچێکت خوارد بە خەسی
ئەبێ بیدەیتۆ دەسی

١٨. هەرچەن برا شوانە
خۆشك هەر چاوەڕوانە

١٩. هەرچەن بێ ژنی بۆ خوا خاسە
جوان و بەدین بێ پەسەن خەواسە
عەوام گوێ نادا هەر کونی تیا بێ
ئەڵێ زۆر باشە لە خوا بە زیاد بێ

٢٠. هەرچەن بێ ژنی چاکە وەك خواجە
کە هێنات کچ بێ، ئەو خۆش مەزاجە

«نامی»

٢١. هەرچەن زۆر بکا زاڵم و زۆردار
هەر ڕۆژێ ئەبێ دەوەن بێ بە دار

٢٢. هەرچەن نەخۆش و بە هیوای‌جاوم
لە حەیبەت تیری کاغەز ئەجاوم

٢٣. هەرچەنێ ئەکەم کارم نابێ ڕاس
نازانم نووشتەی کام بەنەی خواس

٢٤. هەرچی ئەخوا بە شەو تاریك
ڕەنگی زەردە و قولی باریك

٢٥. هەرچەن گاڵین زەواد ماڵین.

٢٦. هەرچی ئەیزانی بەکار وتن نایێ بیری لێ کەرۆ بۆ موناسبەتی جێگە.

٢٧. هەرچی «با» کردی بە دەوار، دەواریش کردی بە «با».

٢٨. هەرچی دلّی من ئەلّیٚ بەشکەم وابیٚ، وا نابیٚ
هەرچی کە خوا مەیلی بیٚ حەتمەن ئەبیٚ هەروابیٚ

٢٩. هەرچی عەیبی دین و دنیایە هەمە هەر عەزابێکم بدەی هێشتا کەمە
«"غەریق" لەگەڵ خودای خۆیەسی»

٣٠. هەرچیکت تا ئێسە کردووەسە کاسە، ئیسەولا بیکەرە کەوچك. من بیٚ نیازم لە تۆ.

٣١. هەرچیکت دۆزیۆ لەم کارا شەریکی منی تیا مەکە. من بیٚ نیازم لە تۆ.

٣٢. هەرچی کە ئەیکەی بە زەبری بازوو بیکە بە شەوا مەچۆ بۆ مازوو
بە شەوا مازووت بۆ چاو ناکریٚ دایشی هێشتیٚ وەك بۆڵە تریٚ

٣٣. هەرچی کە چەقە و ناکوڵیٚ داینیٚن بۆ پوورە گوڵیٚ

٣٤. هەر دایکی کوڕە، شواڵی شڕە.

٣٥. هەرچی گا بیکێڵیٚ، گا نایخوا. :کا کەی بۆ گا، دانەکەی بۆ ساحیۆەکەی».

٣٦. هەرچی گران بیٚ، ئەتوانی خۆت هەرزانی کەی بە نەخواردن و تەرك کردنی.

٣٧. هەرچی گڵ وا بە سەر قەبری باوکتۆ، ئەونە عومری درێژی بۆ تۆ بەجیٚ هێشتییٚ.
«بۆ سەرخۆشی وا ئەڵێن».

٣٨. هەرچی گەڕان بیٚ فاییە ئاخری هاتنۆ سەر کونە قاییە
«قاییە: قاعیدە و قانوون»

٣٩. هەرچی لە کاسەدا بێت، بە کەوچك دەردێت.

٤٠. هەرچی لە کانی دلتۆ دەربیٚ جێی خۆی ئەکاتۆ.

٤١. هەرچێوێت وانا چێوێ تەر وانە باسی مەزاتی، باسی تەرزانە

٤٢. هەرچی هەولم دا بگەم بە پایە مایە و دەسمایەم گشت چوو بە زایە

٤٣. هەر دەوەنە کە ئەبیٚ بە دار لە سایەیا ئەحەسێتۆ هەژار

٤٤. هەر سەر خۆش بیٚ، کڵاو فرەس.

٤٥. هەرچی هات بە خێر هات، خۆمان بەینە بەر قەزاو قەدەر کە هات.

٤٦. هەر سکیٚ بەهارێکە. «واتە: ئەم ژەم بۆ ئەو ژەم خۆشخۆراك بە تا سۆزی خوا خۆی ئەمێنێت و مولکی».

٤٧. هەر سەرێ سەودایێکی هەس.

٤٨. هەر کارێ ئەتەوێ درووس نەبێ — بی سپێرە بە کەسێ ئەهلی نەبێ

٤٩. هەر کردەی ئێمە و بردەی شەیتانە — مەنعی کەس نەکەی خەتای خۆمانە

٥٠. هەرکەس باوك و دایك مۆجگاری نەکا — زەمانە هەر ڕۆژ مۆجگاری ئەکا

جا دڵی باتێ و بڕوانێ بۆ خەڵك — لێیان وەرگرێ نەسیحەت بە کەڵك

٥١. هەرکەس بترسێ لە کوشتنی خۆی — مردن لە ژیان زۆر باشترە بۆی

دوژمنی خوێنی ساز مەکە بۆ خۆت — ئاسوودە خاتر دانیشە بۆ خۆت

٥٣.هەرکەس بە تەمای خاڵۆ و مامۆ بێ — ئێوارە بتێ نان، سبەی بێ دۆ بێ

«هەرکەس بە تەمای خەڵك بێ لە برسا ئەمرێ. کار بکە و نان خۆت بخۆ».

٥٢. هەرکونێ، کونی دەس پیا کودن نیە.

٥٤. هەرکەس بە تەمای سەفەرەلی بێ — هەمیشە برسی و دەسیخاڵی بێ

«سەفرەلی:کورت کراوەی سەفەر عەلییە»

٥٥. هەرکەس بە چاو ئەیبینی بە جاسووسی مەزانە

بازێ گومان کە ئەیبەی بە گوناحی بزانە

«ئیشارەی ئایەتە»

٥٦. هەرکەس بە شوێن عەیبی خەڵکا بگەڕێ، خودا ڕیسواو بێ ئابڕووی هەردوو دنیای ئەکات.

٥٧. هەرکەس بە مل بێ، بە ملۆ ئەڕوا — تەجرەبەی بکە پێم ناکەی بڕوا

٥٨. هەرکەس بێگانە بکەرۆ بە خوێش — بدا بە سەریا بە هەردوو دەس وێش

٥٩. هەرکەس تەمەڵە و ناچێتە ژێر کار — بێزارە لە خۆی، بێزارە لە کار

٦٠. هەرکەس ئازایە، ئازاو زوو بە زوو — ئەڕوا بۆ لای کار بۆی ئەبێ بە خوو

٦١. هەرکەس حەز ناکا لە بەد ناوی خۆی — لانادا لە ڕێی باوك و باپیر خۆی

٦٢. هەرکەس خوا ئەناسێ — دوورە لە هەموو باسێ

هەرکەس خوا نەناسێ — بە خەم دنیا ئەتاسێ

٦٣. هەرکەس خۆی هەلّکێشێ، زەکاتی نەفامی و گەوجی خۆی دەرئەکا.

٦٤. هەرکەس بانی زیاترە، بەفری زۆرترە.

٦٥. هەرکەس ژنی هێنا نیوەی دینــی دامــەزراوە و هــەولّ بــۆ ئــەو نیوەکــەیتــری بــدا. «حەدیسە»

٦٦. هەرکەس عەمەلّ بکا بەوەی ئەیزانێ     خوا فێری ئــەکــا ئــەوەی نــازانــێ «حەدیسە»

٦٧. هەرکەس کە تەسلیم شەریعەت نــەبێ     شــێــخ نیــە، ئیتــر بــڕوات پــێ نــەبێ

٦٨. هەرکەس کە عیلم و عەقلّ و کەمالّی     بــۆ جۆر بوو، ئیتر خۆزگەم بە حالّی

٦٩. هەرکەس کەرێ بباتە سەر بان، ناتوانێ بیهێنێتە خوارۆ بە ئاسان.

٧٠. هەرکەس کە مالّی زۆرە     حــالّی تــەواو نــاجۆرە
یــا زەکــاتــی دەرنــاکــا     یا حەجی پێــوە نــاکــا
یا دوورە لــە حــەلاّلــی     یا مــەغروورە بە مالّی
دەس گرۆیی خەلّك ناکا     ئەزیــەتی زۆریــان ئەکا
ئــەو مــالّە یــاخــوا نــەبێ     ساحێــوەکەیــشی نەبێ

٧١. هــەرکەس کۆپان بێ من کەرم     هەرکەس کەر بێ من کۆپانــم
«بەم دوو جۆرە وتراوە و لە مەعنادا زۆر فەرقیان هەیە».

٧٢. هەرکەس کە وا کۆشا بێ، حەتمەن ئەگا بە ئاوات
کە بڕوا ناکەی بە من بڕوانە بۆ ئەملاولات

٧٣. هەرکەس کیلۆیێ نانی خوارد، ئەبێ چارەکێ عەقلّی بێ.

٧٤. هەرکەس گەرەکیە بەهەشت بنۆشێ     نــەوسی کــوێر بــکاو سیرڕی بپۆشێ

٧٥. هەرکەس گەرەکیە ڕیسوا نەبێ، قسە لـە قەوارەی خۆیا بکا.

٧٦. هەرکەس لـە خوا بترسێ، هەموو کەس لێی ئەترسێ. هەرکەس لە خوا نەترسێ، لــە هەموو کەس ئەترسێ.

٧٧. هەرکەس لـە خوا غافلّە، بێ شك کول و کافرە.

٧٨. هەرکەس لـەڕو لاوازە، ڕەفیقی مەکە، یا نەخۆشی واگیری هەیە یا نەخۆشی دلّ.

٧٩. هەرکەس لەگەڵ تۆ خراپی ئەکات، تۆ لەگەڵ ئەوا باش ببە با تەریقۆ بێت.

٨٠. هەرکەس مرد چاو خۆی پڕ ئەبێ لە خاك، کەس بە بێ ئەو پەکی ناکەوێ.

٨١. هەرکەس مردنی باشە لە ژینی یاخوا زوو بمرێ و تێر بکەین شینی

٨٢. هەرکەس ناوی خەڵك لەلای تۆ ئەبات لەم لا بۆ ئەولا ناوی تۆش ئەبات

٨٣. هەرکەس ناوکە خورمای زۆرتر بێ فرە خۆرترە. «ڕۆژێ حەزرەتی عەلی لەگەڵ حەزرەتی موحەممەدﷺ خورمایان ئەخوارد، حەزرەت ناوکە خورماکەی خۆی لە بەردەم حەزرەتی عەلییا دائەناو ئەمیە فەرموو. حەزرەتی عەلی کە زۆر حازر جواب بوو فەرمووی: «هەر کەس بە ناوکۆ خواردبێتی، فرە خۆرترە»».

٨٣. هەرکەس نقورچکێ بگرێ لە دۆم، چەقۆ بەدەسیۆ زوو تیژ ئەبێ.

٨٤. هەرکەس نیعمەتی زۆرە حەتمەن حەسوودی زۆرە
لێی ناگەڕێ کە بیخوا هەر بە خەسی بەوجۆرە

«وەك ئەڵێن:

زۆرت خواردووە بە خەسی ئەبێ بیدەیتۆ دەسی»

٨٥. هەرکەس یاسای خاس لە ناو خەڵکا جێ بێڵێ، هەرکەس ڕەفتاری پێ بکات، هەتا هەتایە خێر ئەویشی وا تیداو لە خێری ئەوان هیچ کەمۆ نابێتۆ. هەرکەسیش یاسای خراپ بەجێ بێڵێ هەتا هەتایە هەرکەس ڕێی ئەو بگرێ بەشی گوناحی ئەوی وا تیداو لە گوناحی ئەوان کەم ناکاتۆ. «حەدیسە».

٨٦. هەرکەسێ بۆ خۆی خۆش بێ، قەوم و کەس کەڵکی وایان نیە بە تەمایان بیت.

٨٧. هەرکەس بە تەنیا چێ بۆلای قازی دێتۆ بە خۆشی و بە دڵی ڕازی

٨٨. هەرکەسێ پیرێکی نەبێ، پیرێ پەیا بکا بۆ تەگبیر.

٨٩. هەرکەسێ بەهاو نرخ و قیمەتی ڕەفتارو گوفتار نەفسی خۆیەتی.

٩٠. هەرکەسێ پیرێکی نەبێ، سیرێ ناژی.

بەو شەرتەی دایم بە گوێی پیری کا پیرێ کە ژیر بێ و تەگبیری بۆ کا

٩١. هەموو مەرامی بۆ ڕێك ئەکەوێ پشتوێن بکاتۆو بێ خەم بخەوێ

۹۲. هەرکەسێ تەما بکاتە نامووس خەڵك      تەما ئەکاتە نامووسی بێ کەڵك

۹۳. هەرکەسێ چاودێری ماڵ و حاڵ و مناڵ خەڵك بکات، بە داخی خەڵکۆ ئەمرێ.

۹٤. هەرکەسێ حورمەت لە پیرێ بگرێ، خوا خەڵکی بۆ سەر نەرم ئەکا لە پیری‌یاو حورمەتی ئەگرن.

۹۵. هەرکەسێ بگرێ حورمەتی پیرێ      بە پیری ئەویش حورمەت ئەگیرێ

«نامی»

۹٦. هەرکەسێ خاسە، خاسیەکەت ئەڵێ      ئەوەی خراپە، خراپیت ئەڵێ

۹۷. هەرکەسێ دانێ درەختی سەمەر      ئەم ئەبێ بە مێخ ئەو ئەبێ بە کەر

۹۸. هەرکەسێ شۆخە، شۆخی بێ خۆشە      شۆخی دەرمانی دەردی نەخۆشە

شۆخی زۆر خۆشە لە تام دەر نەچێ      لە چوارچێوەی شەرع ئیسلام دەرنەچێ

۹۹. هەر کلکێ شەرع بیبڕێ خوێنی نیە.

۱۰۰. هەرکەسێ خۆی بناسێ، خوای خۆیشی ئەناسێ. «حەدیسە».

۱۰۱. هەرکەس خێزانی زۆرە      ئیش و کاریشی زۆرە

بەگزادەیە یا بۆرە      خەم و خەفەتی زۆرە

۱۰۲. هەرکەسێ دەس بۆ دەم خۆی ئەبا، تۆیش بۆ خۆت شتێ پەیا بکە.

۱۰۳. هەرکەس کەس و کار بیکاتە ترۆ      بە هیچ کەسێکتر نایکرێ پەڕۆ

۱۰٤. هەر گەمەیە ئەبێ بە ڕاس.

۱۰۵. هەرکەسێ لە ئارامی و نەرم ونیانی بێ بەش بێ، لە هەموو خێرو بەرەکەتێ بێ بەشە. «حەدیسە».

۱۰٦. هەرکەسێ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ بە ئیمان و لە گوناح پارێز بکات، گوناحە پێشووەکانی ئەبەخشرێ.

۱۰۷. هەرکە نان گاور بخوات، ئەبێ سەلاوات لە دیار گاور بدات.

۱۰۸. هەرکەسێ ڕیشی سوور بێ هەمزە ئاغا نیە.

۱۰۹. هەر گیانداری جەرگی تەڕ بێ خێری پێ ئەشێ. «حەدیسە».

۱۱۰. هەر لە عەرش هەتا قورش      کەس بە دۆی خۆی نالێ ترش

١١١. هەر مل درێژیّ وشتر نیه.

١١٢. هەرمیّ گوڵاوی، پەنە مەیاوی. «هەورامی بە منالّیّ زوو کەوتابیتە خۆو قوتە قوت، ئەوەیانە پیّ ئەوت».

١١٣. هەر وەخت قشقەرە هات، گورگ وا بە شوێنیۆ.

١١٤. هەروەکوو ئاوێنە وابە، ڕوو بە ڕوو عەیبی خۆمم بۆ بەیان کە، دوو بە دوو
نەك وەکو شانە بە تیـعـدادیّ زوان موو بە موو لە پشتی سەر بیکەی بـەیان

١١٥. هەزار یارم بیّ وەك حۆری و پەری هـەر تـۆ یـارمی هـەموو بـیّ بـەری

١١٦. هەر گەمەیە شەڕی لیّ بەرپا ئەبیّ.

١١٧. هەر هاتنیّ حەتمی بیّ نزیکە. «بۆیە خوا بە قیامەت ئەفەرمیّ: سۆزی».

١١٨. هەزار وەکوو من و تۆ ئەباتە سەر ئاوو بە تینوویی ئەیهێنێتۆ. «ئەونە فرەزانە».

١١٩. هەموو ساڵیّ لە سەر عەرزا وەکو یەك ئەباریّ با لە وڵاتانا کەم و زیادی‌یان هەیە. «حەدیسە. ئاوی سەرزەوی بە هەڵمۆ ئەڕواتۆ بەرەو ئاسمان و بـە ڕەنـگ بـەفرو بـاران و تەرزە و زوقم و سیخوارو شەونم یێتۆ بۆ سەر زەوی. ئەمە ئیشارە بە ئایەتی «والسّماءِ ذاتِ الرّجعِ» لە سورەی «والسّماءِ وَالطّارِقِ» ئەکا».

١٢٠. هەمووکەس خاسی و خراپی هەیـە دنیـا هـەر وایـە و دنیـا نۆرەیـە

١٢١. هـەوای بـەرم داویـە لـە سـەرم مەگـەر هەوڵیّ بەن بۆ چـارە سـەرم

١٢٢. هاوسیّ لە هاوسیّ ئەگریّ سەراسیّ ئەیخاتە کەڵەك کول دەنـگ و باسـیّ

١٢٣. هاوسیّ وەزەنی مەکە.

١٢٤. هیچکەس لە ئێوە ئیمانی تەواو نابیّ تا حەز نەکا بۆ برای دینی خۆی ئـەوەی کـە بۆ خۆی حەزی لیّ ئەکا. «حەدیسە»

١٢٥. هێسر وەختیّ زاو، «کێکف» هاتە بـەر ئـەوسـا ئـەبـیـنـیّ بـاڵای سنـەوبـەر
«کوڕێکی بێکارە داوای ژن لە باوکی ئەکاو ئەویش وای پـیّ ئـەڵیّ. کێکـف: دارێکـی کێوسانییە کە هیچ بەرێکی نیە.».

١٢٦. هەزار کۆشکت بیّ هەریەك لە ڕەنگیّ ئـەی گۆڕێتـەوە بـە تەختـە سـەنگیّ

***

# پیتی <ی>

## پەندی پێشینان

١. یاخوا ئەم خشە خشە هەمووی هەر شیر بێ.

٢. یاخوا هەر زستان زستان بێ، لە بەهارو پاییز نەکەوێتە سەری.

٣. یا کاغەز بڕیان یا مەڵلا مەردەن — یا خۆ عارتەن دۆس وە یاد کەردەن

غەمگین مەنیشە غەم بتدەر وە باد — فەڵەك نمازۆ کەس وە خاتر شاد

«شێخی "سراج الدّین" ی ئەوەڵ بێ تاقەت بووە و بۆ مەولەوی ئەو دوو شیعرەی نووسیوە. مەولەویش لە وەڵاما ئەنووسێ:

شێخی دەوڵەمەن بەهرەی سەرمەدی — یاگەی حەقیقەت، جیلوەی ئەحمەدی

جە شەو هەوراگە فەنای ویەردە — پای هەردە بەقا یا تاغە کەردە»

٤. یاخوا بەخێر بی مێوانی ئازیز — یا بە ڕۆژ بەهار یا بە شەو پاییز

٥. یاخوا ئەم دەس موحتاج ئەو دەس نەبێ.

٦. یا باوە گورگور، بەگوڕ هاتم، بۆ کوڕ هاتم.

٧. یاخوا ئەگەر ژن دۆسی بێ دۆسەکەی ژیر بێ، با ئابڕوویان نەڕوا.

٨. یاخوا ئەوە کە ساحێوماڵ ئەزانێ، دز نەیزانێ، هیچ لە ماڵا نایەڵێ.

٩. یاخوا بەفرێ بباریێ، حەوشەکەمان داشارێ. «سروودی مناڵانە»

١٠. یاخوا بە کوڕی کەس نەڵێن ئازاو بە کچی کەس نەڵێن جوان. «با لە خۆ بایی نەبن».

١١. یاخوا بێ کوڕی ماڵی وێران بێ، ئەگەرنا ئێوەش هیچ لە کوڕ ناچن کە ئەدەب و هونەرتان نیە. «پیاوێکی گەورە بە دوو کوڕی بێ کەڵکی خۆی وای وتووە».

١٢. یاخوا تاقانە بێ بەرەکەت بێ. «بە تاقانەیەك وا ئەڵێن کە لێی ڕازی نەبن»

١٣. یاخوا دووکەڵم نەچێ بە چاو کەسا. «واتە: ئازارم بۆ کەس نەبێ»

١٤. یاخوا ژن قنگ نەکاتە شەق، کەس چاری بۆ ناکرێ.

١٥. یاخوا ژن نـەداتە لان بـێحـەیایی بێڵەکان هەڵ ئـەگرێ زەوی مـەگایی

١٦. یـاخوا شـێر لـە بێشە نـەبڕێ تایفـە پیـاوچاکی لـێ نـەبڕێ

١٧. یاخـوای گەورە، بێ خەم و بێ باك بـمکە بە خـاتر شاهەکەی لـەولاك

عەلاجـێکـم کـە کە بێ عـەلاجـم لە هەر دوو دنیـا بـە تـۆ موحتـاجم

دەردم دەوا کە تـەواو بـە بـاشـی مەمـخەرە بـەردەس نـەزان و ناشـی

دەوای فـاسدو عێـوەزیـم بـاتـێ لە دوای خواردنی نەسـرەوم سـاتێ

١٨. یاخوا کاڵە لەپی نەیێتە سەر قـەبرم لە وەختـی بـەفرو سـەرمادا نـەمرم

١٩. یاخوا کای کۆنە ئاوری تێ نەچـێ دڵـدار بـۆ دڵـدار تاقـەتی نەچـێ

٢٠. یاخوا شەڕو تڕ درگا بەکەس نەگرێ

٢٠. یاخوا شەڕو تڕ درگا بەکەس نەگرێ

٢١. یاخوا فرمان کەرم بمرێ تەگبیرکەرم نەمرێ. «بە گەورەی ماڵ ئەڵێن تەگبیرکەر».

٢٢. یاخوا قەزا کە هات لە دەرگای گەورەکە کـەوێت. «واتـە لـە حـەیوان نـەك لـە ئینسان».

٢٣. یاخوا کەم بێ و بە کەرەم بێ. «بە تاقانەیەك وا ئەڵێن کە لێی ڕازی بن».

٢٤. یاخوا نەگبەتی ڕوو نەکاتە هیچ ماڵێ. «واتە: ئاژاولە نەکەوێتـە بـەین خێـزان ئـەو ماڵە».

٢٥. یاخوا هەر ڕزقت سوار بێت و خۆت پیادە بی و هەر نەیگەیێ.

٢٦. یاخوا هیچ ژنێ داوێن خۆی لێ نەبێ بە دوژمن. «واتە: منالّی».

٢٧. یاخودای گەورە یاوێك و تاوێ. «واتە: یاوێکم بۆ بنێرە و بە تاوێ گیانم دەرچێ».

٢٨. یـا دانا بـە، یا پـرسـا بە. «با بە هەڵەدا نەچی»

٢٩. یار باقی و سوحبەت باقی.

٣٠. یارۆ وەسە گای مارۆ، «لە گاگەلێکا دیارە».

٣١. یاسین بە گوێی کەڕا خوێندن هیچ نیە غەیری خۆ مانوو کردن.

۳۲. یا کەڕ بە بۆخۆت یا خۆت بکە بە کەڕ
دوور بە لە دەردو بەلای سەگە شەڕ

۳۳. یاکەریم ئامان کێ عادەت کەردەن
تۆشە وە دەرگای کەریمان بەردەن
«مەولەوی لەگەڵ خوای خۆیا وای وتووە»

۳٤. یا کەسی بێکەس، یا کەسی بێ دەس
فریامان کەوە تەنگانەمان هەس

۳٥. یا کەسێ ناوی گەورەی دەوایە
یادی بۆ دڵ و دەروون شیفایە

۳٦. یا وەفای بۆخۆی نەبوو لە دنیا
یا کەسی نەبوو بیکا لەم دنیا

۳۷. یەزد دوورە گەز نزیکە. «لە جووابی کەسێکا وتراوە کە وتوویەتی: لە یەزدا چڵ گەز بازم بردووە».

۳۸. یەکڕوو و یەك خوو بە، دوو ڕوو و دوو خوو مەبە با باوەڕت پێ بکەن.

۳۹. یەك ساڵ بە کەڵەشێری بژی، باشترە لە سەد ساڵ بە مامری.

٤۰. یەکێ بوو یەکێ نەبوو، کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. کۆسە مرد کفنی نەبوو. نایان بە تاقۆ، چاوی چوو بە زاقۆ. نایان بە سەرمیچۆ، ددانی چوو بە ڕیچۆ.

٤۱. یەکێ کەمە، دووان خەمە، سیان خاتر جەمە. بۆیە سێیەمینە سوننەتە.

٤۲. یەکێ ماینی نەبوو، ئەچوو ئاخوڕی ئەبەست.

٤۳. یەکیەتی تاجە، یەکیەتی تەختە
یەکیەتی نەجمە، شانی خۆشبەختە

٤٤. یەکێ نانی نەبوو، ئەچوو پیازی ئەسەند.

٤٥. یەکیەتی گەل زامنی سەرکەوتن و سەربەرزییە
تاکو من ماوم هومێدم هەس بە ئەم سەربەرزییە

٤٦. یاخوا داکاتە باران بۆ فەقیرو هەژاران. «سروودی منالان بووە بۆ باران بارین».

٤۷. یا ڕەب بۆ خاتر کۆمەڵ ئەولیا
بە نووری پاکی هەموو ئەنبیا
لابە لە دڵم خەفەت و قەسوەت
ئاخرم بێنە لە سەر سەعادەت
عەفوم کە لەگشت خەتاو تاوانم
سەبتی دڵم کە نووری ئیمانم

***

# دەوای پێشینانی خۆمان

## کتێبی کەلەپووری کوردی بەشی دووهەم

نەخۆشینی خۆمان بە گژو گیای خۆمان دەرمان ئەکەین. عەواریزی نیە و خەرجی کەمترە و نەفعی زۆرترە، وە کەمتر ئەگەڕین بە شوێنیا.

١. ئیسهالی: نەعنا (یا: پونگە) بە چایی یا بە هەر جۆری‌تر بیخۆی.

٢. نەخۆشی پێستی (وەك: خارشت): (١- قازیاخە (٢- گەزنە، بە هەرجۆر بۆت ئەخورێ بیخۆ.

٣. ئەسپەندەر (قانگ): دەوای ڕۆماتیسم و دیسك کەمەرو دەردی جومگەکانە. شەو بە کەفلەمەیێ بیخۆو ئاو بخۆ بە سەریا.

٤. بۆ زەخم و ئێش مەعیدە و ئاو سێفە زەمینەی کاڵ و بەڕووی دار بەڕوو زۆر چاکن.

٥. بۆ ژنێ تازە منداڵی بووبێ: خواردنی خورما باشترین خۆراك ودەوایە. «حەدیسە»

٦. بۆ زەخمێ تازە کە خوێن ڕێژی ئەکا: ئاردی ترشی سماق کە بیکەی بە سەریا، فەورەن بەربەسی خوێنەکەی ئەکا.

٧. بۆ ڕەوانی میعدەی گەورە و بچووك: خەیار چەمبەر (ڕووەکێکە کە بە زۆری لە ولاتی هیندوستاندا ئەڕوێت، وەك ترۆزی دریژە بەلام ئەم ڕەنگی ڕەشە و باریکترەو ناوکی کەمتری تێدایە. ئەم خەیار چەمەرەش لە کوردەواریدا بۆ چارەسەری نەخۆشی باژێلەی منالێ بەکار ئەبرێت)، ناوك و تۆمەکەی لابە و لە ئاوا بیتاوێنەرۆ و بیخۆ.

٨. بۆ گمیزە چرکێ ئاوی کووزەڵە باشتر دەوایە، خۆت مەکە هەڵە ئاوی تووریش هەر باشە.

٩. بۆ تەقویەت و تەسفیەی خوێن: تا ئەتوانی تەماتە سوورە بە کاڵی و کولاوی و برژاوی بـخۆ.

١٠. بۆ لابردن سەرئێشە و كاسی سەر: بۆنی نەرگس و وەنەوشە زۆر باشە.

١١. بۆ سینۆزیت: هەڵمی گوڵە حاجیانە كە بچێ بە سەر نەخۆشەكەدا، زۆر باشە.

١٢. بۆ خوێن ڕێژی ژنان كە زیاتر بێ لە عادەت: چەن مسقاڵێ زیرە، نیوەی بۆ بدات لەبەر ئاورو هەردوو بەشەكە تێكەڵ بكاو بیكاتە ناو حەلیماوی پلاوێ كە لە ئاوا لینجی بداتۆ و بیخوات.

١٣. بۆ كەسێ كە سەری زەربەی لێ كەوتیێ: ئاردی جۆ بە ئاوی ڕیشەی هەڵمەڵە، بیكە بە هەویرو تێی بگرە.

١٤. بۆ لەبەین چوون كرمی میعدە: خواردن چێشت پەڕشە دەوایە.

١٥. بۆ كەم كردن چەوری خوێن و نەخۆشینی شەكرە (مرض قند): چای گەڵا گوێژ دەوایە.

١٦. بۆ ڕوانی و قووەتی چاو: هەلیلەی سیا دانە قووتی بدەی زۆر چاكە. هەروەها ئاوی گێزەریش (هەویج).

١٧. بۆ قۆزە و سەرما خواردن: چایی زوفا یا هەزبێ كێویلە یا گوڵە حاجیانە. هەنگوێنیش هەر باشە.

١٨. بۆ سەرئێشە: هەڵمژینی خوێ ورد بە لووت تا ئاو دێ لە چاوت، چاك ئەبیتۆ.

١٩. بۆ لە بەین چوون كرمی ناوسك: گەڵا ڕێواس زۆر باشە بە تایبەت بە یاپراخ. (دۆڵمە)

٢٠. بۆ تەنگە نەفەسی: گوڵی گۆزروان كە بە چاییۆ بیخۆیت.

٢١. بۆ بەردی گورچەویلە (سنگ كلیه): شووتی، چای گەڵا زوورڕەت یا پێكۆڵ یا قەیتەران یا خواردن چێشتی پەڕشە.

٢٢. بۆ سینە ئێشە: چایی گوڵە باخی، بەی بە پیشاوی یا ناوكەكەی، یا چایی گەزنە و گۆزروان.

٢٣. بۆ هەڵوەرینی موو: گەزنە بخۆ یا وەنەوشە، كەوچكە چاییێ وەنەوشەی وشك بكە ناو پیاڵەیەك و ئاو گەرم بكە بە سەریا، سەری بنێرۆ تا دەم ئەكێشێ، جا بیخۆ.

٢٤. بۆ خارش بەدەن: چایی چەقچەقە یا شاتەرە. وە خاك شیر بە كەفلەمەیی بیخۆو

ئاو بکە بە شوێنیا.

٢٥. بۆ سك ئێشە: چایی ولە زەردە یا زۆفا یا گوڵە حاجیانە یا هەزبیێ کێویلە.

٢٦. بۆ چاوێ کە کەم بینا بێ: دووکەڵی خەربەنگ دەوایە.

٢٧. بۆ سەر زەخم: گەڵای گوێ بەرخیلە بـخەرە سەری.

٢٨. بۆ فشار خوێن: گەڵای زەیتوون بکە بە چای کەم ڕەنگ و بیخۆ، یا ڕیشەی ڕێواس.

٢٩. بۆ چاوێ ئێش بکات و ماسیبێت: یەکێ لـەمانە بـخەرە سەری (١- گەڵای فاتـمە دارو (٢- گوڵی هێرۆ (هەرمەڵە) (٣- گەڵا بی (٤- گەڵا ڕکێشە. ئەمانە بۆ سەر برینیش باشن.

٣٠. بۆ گرفت و بێ ئیشتیهایی میعدە: سێف خواردن.

٣١. بۆ بەردی گورچیلە (سنگ کلیە) و چڵکی کاکۆڵ: گەنـمە شامی و تووی گنۆڕو قەیتەران و پەیکوڵ بە جیا یا بە تێکەڵی بیکە بە چای و هەر ڕۆژێ چوار جارو هەر جارێ یەك لیوان لـە بەرو دوای خۆراکا بـخۆ.

٣٢. بۆ چڵکی سینە و دەنگ گیران: تووی گەڵا ڕکیشە بیکە ناو ئاو با تەواو بخووسێ، جا بە جارێ بیخۆ.

بۆ نـموونە ئەمانـمە نووسی، تۆ بۆ دەردەکانت دەوای لـەم جۆرانە پەیا بکە. خۆت زەلیلی دەوا و دوکتۆر مەکە. «باشتر وایە بۆ زانیاری زیاتر لـە ئەم دەردو دەرمانانە تەماشای کتێبی "گژو گیاو ئاژەڵ" دانراوی "میرزا صدیق ئەحمەد چنگیانی" بکەی».

***

# سروودی نەورۆز

## کتێبی کەلەپووری کوردی بەشی سێهەم

نەورۆزە، دڵم تازە بووەتۆ
بە فەسڵی بەهار کە شاد بووەتۆ

نەورۆز لە زوو ئینتیزار ئەکەم
بە هەوای خۆشت دەردم چارەکەم

دایە پێم بدە زوو جەژنانەکەم
بە خۆشی با بچم بۆ سەیرانەکەم

بەهاربەخێر بی، فەسڵێکی خۆشی
دەرمان و دەوای دەردی نەخۆشی

بەهار بەخێر بی، فەسڵی گوڵانی
فەسڵی وەسڵەتی بەینی دڵانی

دیلی و ئەسیری، فەسڵی زسانە
بەهار ئازادی و فەسڵی گوڵانە

فەسڵی بەهارە، دنیا ڕەنگینە
بە ئەنواعی گوڵ، زەوی نەخشینە

بولبوڵ ئەخوێنێ بە سەر چڵانا
داخ ئەنێ بە سەر جەرگ و دڵانا

بەفراوان ئاویان لێ ئەبێ جاری
هەر وەکو باران هەوری بەهاری

هاژەی شەتاوان بۆ عەتری شەوبۆ
ئەدا لە دەماخ چەن وەك من و تۆ

تەبیعەت هەر شت ئەجووڵێتەوە
هەر جنسێ هاوجووت ئەدۆزێتەوە

هەریەك بە جۆرێ ئاواز ئەخوێنێ
هەریەك بە ڕەنگێ خۆی ئەنوێنێ

بەهار بە وێنەی بەهەشتی بەرین
خوا نیشانیەدا لەڕووی سەرزەوین

بۆ ئەوە بەشەر شوکری خوا کا
بە تاعەت تەمای بەهەشت پەیا کا

بزانێ خالیق ئەم ڕەنگاو ڕەنگە
ئەم گوڵ و گوڵزار، باخە قەشەنگە

تەنیا ئەڵڵایە پاك و بێ باکە
لە هەموو عەیب و نوقسانێ پاکە

بەهار دووبارە هاتۆ بۆ لامان
تاوێ با خەفەت لاچێ لە لامان

بە بینینسەوزی وگوڵ وگوڵزاری
هاژەی شەتاوان کە ئەبێ جاری

دڵ هەر وەك گوڵ ئەگەشێتەوە
ئەنواعی ئەفکار ئەبەخشێتەوە

بەهارە موحتاج بە دوو نەهارە
ڕۆژگار درێژە و گەرمەیی کارە

***

# چوار وەرزی ساڵ و دوانزە مانگە

## کتێبی کەلەپووری کوردی بەشی چوارەم

چوار وەرزی ساڵ:

چوار وەرزی ساڵ و دوانزە مانگەی ساڵی کۆچی هەتاوی و مانگی لە یەك ساڵا دەسیان پێ کردووە و ئەویش ساڵی «هیجرەتە». کۆچ کردنی پێغەمبەر حەزرەتی موحەممەدﷺ لە مەککەی موکەڕڕەمەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە کە خوا لێ خۆشبوو حەزرەتی عومەری فارووقؓ کردی بە تاریخی ئیسلامی و لە تاریخی زاینی جیای کردەوە. تاریخی میلادی واتە مێژووی لە دایك بوونی حەزرەتی عیساؑ کە لە هەموو ساڵێکا لە یازدەی زستاندا دەس پێدەکات و ئێستا ٢٠٠٤ی میلادیە و ساڵی میلادی وەکوو هەتاوی و کوردی وەهایە و سەرساڵەکەی ناگۆڕێ.

تاریخی هەتاوی (شمسی) و کوردی هەردوو لە نەورۆزا دەست پێ ئەکەن و لەوەو پێش لە هەموو ساڵێکا دوو جەژنیان گرتووە. جەژنی نەورۆزو جەژنی میهرەجان کە لە ئەوەڵی پاییز بووە و ئێستا لاچووە.

ساڵی شەمسی ٣٦٥ ڕۆژو شەش ساعەتە و چوار وەرزی ساڵی هەیە: بەهار، هاوین، پاییز و زستان. هەر وەرزێ سێ مانگی هەیە. بەهار ٩٣ ڕۆژە و هەر مانگێکی ٣١ ڕۆژە. هاوین ٩٣ ڕۆژە و هەر مانگێکی ٣١ ڕۆژە. پاییز ٩٠ ڕۆژە و هەر مانگێکی ٣٠ ڕۆژە و زستانیش ٨٩ ڕۆژە و هەر مانگێکی ٣٠ ڕۆژە. بەڵام مانگی ئاخری زستان ٢٩ ڕۆژو شەش ساعەتە کە بە چوار ساڵ ئەبێ بە ٣٠ ڕۆژو ئەو ساڵە پێی ئەڵێن ساڵی کەبیسە.

نەفەرێ کە ژیانی زۆر پێ خۆش بووە، ئاواتی خواستووە کە هەتا هەتایە خوا نەیمرێنێ و وتوویەتی خوای گەورە:

بەهار مەمکوژە، وەرزی گوڵانە
هاوین مەمکوژە، گۆشتە گەنانە
پاییز مەمکوژە گەڵاڕێزانە
زستان مەمکوژە بەفرو بۆرانە

| | مانگەکانی وەرزی بەهار | مانگەکانی وەرزی هاوین | مانگەکانی وەرزی پاییز | مانگەکانی وەرزی زستان |
|---|---|---|---|---|
| کوردی | خاکە لێوە (نەورۆز) | پووش پەڕ | ڕەزبەر | بەفرانبار |
| فارسي | فروردين | تير | مهر | دي |
| ڕۆژ | ٣١ | ٣١ | ٣٠ | ٢٩ |
| کوردی | گوڵان (بانە مەڕ) | گەلاوێژ | گەڵاڕێزان | ڕێبەندان |
| فارسي | ارديبهشت | مرداد | آبان | بهمن |
| ڕۆژ | ٣١ | ٣١ | ٣٠ | ٢٩ |
| کوردی | جۆزەردان | خەرمانان | سەرماوەز | ڕەشەمە |
| فارسي | خرداد | شهريور | آذر | اسفند |
| ڕۆژ | ٣١ | ٣١ | ٣٠ | ٢٩ |

**ساڵ لە نەورۆزۆ ئەوا بۆ نەورۆز، ٣٣ ساڵ و چوار مانگی پێ ئەچێ و ئەوە پێی ئەڵێن قەڕن. وە لەوساوە تاریخی هیجری دەسی پێ کردووە. لە موحەررەمەوە تا ئێستا ٤٣ دەوری داوەتەوە کە ٤٣ قەڕنە و ساڵی شەمسی لە دوای نەورۆز بەرەو بەهار ئەڕوات.**

**ئێستا ساڵی ١٤٢٥ هیجری قمری‌یە (کۆچی مانگی)و ساڵی ١٣٨٣ هیجری شمسی‌یە (کۆچی هەتاوی). بەوجۆرە قەمەری ٤٢ ساڵی لە شەمسی زیاترە کە ٤٢ دەوری تەواو کردووە. ئەم ساڵی شەمسی و قەمەری‌یە لە پێش ئیسلامدا هەر بوون، وەکوو ئایەتی ٢٤ سوورەی «الکهف» بەیانی ئەکا: ئەسحابی کەهف ٣٠٠ ساڵ بە خەوتوویی لە غارەکەدا مانەوە بە ساڵی شەمسی، کە بە ساڵی قەمەری ٣٠٩ ساڵ بووە. یان ٩ قەڕنی ئیسلامی، یان ٩ دەورە.**

**لە ئەوەڵی بەهارا ١٨ ڕۆژی پێی ئەڵێن سێ شەش و ١٢ ڕۆژی پێی ئەڵێن سێ چوار، کە ئەمە ٣٠ ڕۆژە. جافی وتوویەتی:**

**لەعنەت نامەت بێ نەچیتە هەوار        هەتاکوو نەڕوا سێ‌شەش‌و سێ چوار**

وادیارە لە پێش ئەو وەختا چوونەسە هەوارو لە ژێر دەوارا لێیان قەوماوە، بۆیە وایان وتووە.

لە ٤٣ ی بەهارۆ تا ٥ ڕۆژی پێی ئەڵێن تارو باران بڕان و دوای تار کە باری پێی ئەڵێن بەختە باران. لە جێیەکا بەختیان بێ باران ئەبارێ و ئیتر عادەتەن ئەبێ تا نیوەی پاییز باران نەبارێ و لە نیوەی پاییزا ئەڵێن حقە پەڵە کە عادەتەن ئەبێ باران ببارێ.

لەمەو پێش کەرەی تاریان هەڵئەئەگرت و ئەیانکرد بە ئیحسان و زیافەتی و ئەیانوت «کەرەی تار ناچێتە بار» و هەرکەس لە تارا بە ڕۆژا بخەوێ تا ئەو ساڵە تەواو ئەبێ، خەواڵوو ئەبێ و ئەیانوت فلان کەس وەکوو پێنج ڕۆژی تار وایە لە سەر هیچ حەسابێ نیە بۆیە کەڵکی پێوە نیە.

چل ڕۆژی ئەوەڵی هاوین پێی ئەڵێن «چلەی هاوین» و لە ناوەڕاسی هاوینا هەسێرەی گەلاوێژ دەرئەکەوێ. ئەم هەسێرە کەم کەم لە بەیانیانا دەرئەکەوێ و بازێ مێوەی کێوسانی وەکوو ترێ و تەماتە پێ ئەگاو پێی ئەڵێن مێوە ڕەسان و لەو کاتەدا وەختی «کۆڵە بەسە» یا ئاوەنیایە. لەوە پێش لە ئەوەڵی پاییزدا جێژنێکی باشیان گرتووە بە ناوی جەژنی میهرەجان. لە خۆشی حاسڵ و مێوە پێگەیشتنی ئەو ساڵە.

لە پاییزدا بە تەواوی دەس ئەکرێ بە جووت و توو وەشاندن بۆ ساڵی داهاتوو. لە سەرمای پاییزدا کەم کەم گەڵای دارەکان ئەوەرێت و ئەبێ زۆر لە سەرمای پاییز خۆپارێزی بکرێ تا پاییزە ڕێز نەبین.

وەرزی زستان داستانی زۆرە، لەبەر ئەوە کە زەحمەتی زۆرە و بە تایبەتی بۆ دێهاتیش. لە بازێ جێدا وەك شاری سنە کە وەسیلەگەلێ وەك یەخچاڵ و ماشین نەبووە، بە زەحمەتێکی زۆر شووتیەیان هەڵئەگرت بۆ شەوی «یەلدا» (ئەوەڵ شەوی زستان) کە لە هەموو شەوێ درێژترە و بە خۆشی دائەنیشتن و ئەیانخوارد.

لە ئەوەڵی زستانۆ تا چل شەو پێیان ئەوت «چلە گەورە» و بیست ڕۆژی تریان دائەنا بە «چلە بچووك» و ئەمە دوو مانگی ئەوەڵی زستان بوو.

بازێ لە کوردان ئەڵێن: لە نیوەی زستاندا کوڕێکی سەیادی کورد ئەچێتە هەردو کۆڵێ ئەنێتە کۆڵ کە بە ئەندازەی نیوەی دنیا قورسە و ئارەقی زۆر ئەکات و دوای ئەوە

هەوا خۆش ئەکات بازێ تریش ئەڵێن: لە نیوەی زستانا پشکۆی گەورە دائەکەوێ و هەوا خۆش ئەکا.

حەقیقەت ئەوەیە کە لە نیوەی زستان بەولاوە بەلای بەهارا ئەچین و ڕۆژگار درێژ ئەبێ و هەوا خۆش ئەکا.

هەورامانی و ئەو پێنج دێیە کە وان بە دەوری پیـرشالیارا، شار «هەورامانی تەخت»، «سەرپیـر»، «ڕوەوەرێ»، «کەمالاّ» و «وەیسیا» لە نیوەی زستاندا چیرۆکی زەماوەنی پیرشالـیار ئەگێڕن و بە لێنان چێشتێك کە هەر تایفە زووتر لێیان ناوە و بە زکری تایبەتی کە زووتر کردوویانە و بە هەڵپەڕکێی تایبەتی ئەو وەختە و بە حەیوان سەربڕین و ئیحسان بۆ ئەو زەماوەنە و لەو ڕۆژەدا بەفری سەر پیرشالیار ئەماڵن و مەشهوورە دوای ئەوە هەوا خۆش ئەکات و ئەڵێن شوێنێکیان پەرژین کردووە بۆ مەنعی بەفر بە ئەمری خوداو ئیتر بەفری لێ نەباریوە.

دوای نیوەی زستان، پێنج ڕۆژ ناوی «هەمە دیلە» کە هەموو کەسێ لەو ڕۆژانەدا وەسە دیل و پێنج ڕۆژی تری ناوی «بزنە کۆڵە» کە لەو ڕۆژانەدا پیاوێ تەنیا بزنە کۆڵێکی بووە و لەبەر بێ تفاقی سەری بڕیوە.

زستان کە یەك مانگی ئەمێنێ، ١٨ ڕۆژی پێی ئەڵێن «برجی کەو» کە لەو ڕۆژانا کەو لە گەرمیانۆ دێنۆ بۆ کێوسان و خەڵك دەس ئەکەن بە ڕاوی کەو. ١٢ ڕۆژی ئاخری مانگی زستان پێی ئەڵێن «برجی ترازو» کە هەسێرەیەك لەو وەختا لە بەیانیانا دەرئەکەوێ و پێی ئەڵێن ترازوو و بە ئارەزوو ئەبارێ.

لە ٢٠ ڕۆژی ئاخری زستان بەولاوە، حەوت ڕۆژی پێی ئەڵێن «سەرما پیرە ژنانە» (برد العجوز) و سێ ڕۆژی ئاخری پێی ئەڵێن «خاتوو زەمهەریر» کە لە لاسەرەکانی ئەچڕێت و تەرزە ئەبارێ.

***

# کات و ساتی نوێژ

## کتێبی کەلەپووری کوردی بەشی پێنجەم

تا کات و ساتی نوێژ نەزانین ناتوانین نوێژ بکەین

لە ئەوەڵی بەهارا، ڕۆژگار لە خۆر کەوتندا تا مەغریب ١٢ سەعاتە و لە مەغریبا تا خۆر کەوتن ١٢ سەعاتە و ئەم مساواتە، پێی ئەڵێن «ئیعتدالی ڕەبیعی» واتە: ڕێك وێساندنی شەوو ڕۆژی بەهاری. وە لە نەورۆزەوە کەم کەم ڕۆژگار سێ سەعات زیاد ئەکاو تا ئەگاتە هاوین تەقریباً هەر ڕۆژێ ٢ دەقیقە و هەر مانگێ یەك سەعات. لە ئەوەڵی هاوینا ڕۆژگار لە خۆر کەوتنا تا ئێوارە ١٥ سەعاتە و لەوێوە کەم کەم تا پاییز سێ سەعات کەم ئەکات و هەر مانگێ سەعاتێ و هەر ڕۆژی ٢ دەقیقە. لە ئەوەڵی پاییزدا، لە خۆر کەوتنەوە تا مەغریب ١٢ سەعاتە و لە مەغریب تا خۆر کەوتن ١٢ سەعاتە. ئەم ڕێك وێساندنی شەوو ڕۆژە پێی ئەڵێن «ئیعتدالی خەریفی» واتە ڕێك وێساندنی پاییزی.

لە ئەوەڵی پاییزەوە تا ئەوەڵی زستان، ڕۆژگار ٢ سەعات کەم ئەکات و هەر مانگ ٤٠ دەقیقە و هەر سێ ڕۆژ ٤ دەقیقە.

لە ئەوەڵی زستاندا ڕۆژگار ١٠ سەعاتە و شەوەکەی کە شەوی «یەلدا» یە لە هەموو شەوێ درێژترە و ١٤ سەعاتە تا خۆر دەرکەوتن. لەوێوە ڕۆژگار کەم کەم تا ئەگاتە بەهار ٢ سەعات زیاد ئەکات و هەر مانگێ ٤٠ دەقیقە و هەر سێ ڕۆژ ٤ دەقیقە.

فاییدە لەم باسانە ئەوەیە کە یەکێك لە شەرتەکانی نوێژ، زانینی داخلٌ بوونی وەختی نوێژەکەیە. بە فەرمایشی خوا لێ‌خۆش بوو ئیمامی غەزالی لە کتێبی «احیا العلوم»دا لە باسی کاتی چاشتە نوێژدا: ئەبێ ڕۆژگار لە خۆر کەوتنەوە تا ئێوارە بیکەی بە چوار بەش و لە ئەوەڵی بەشی دووهەمدا نوێژی چاشتە کەماڵ پەیا ئەکا، لە ئەوەڵی بەشی سێهەمدا نیوەڕۆ ئەبێ و لە ئەوەڵی بەشی چوارەمدا نوێژی عەسرو لە ئەوەڵی تاریکی و کاتێك کە خۆرئاوا ئەبێ، کاتی نوێژی مەغریبە.

لە تاریکی دووهەم کە تەواو دنیا تاریك ئەبیٚ نوێژی عیشا ئەبیٚ و مەغریب نامێنیٚ. بە فەرمایشی ئەو بەڕێزە: عەلامەتی ئەم تاریکی دووهەمە دەرکەوتنی چەرخ و فەلەکە کە پێی ئەڵێن ڕێی «کهکشان» لە ئاسماندا و کەسیٚ لە دەشتا تەجروبەی بکا لە ٥٠ دەقیقە دوای مەغریبدا دەرئەکەویٚ و لەو کاتەوە تا

تلووعی فەجری سادق کە بە کەناری ئاسماندا بڵاو ئەبێتەوە نوێژی عیشا ئەمێنیٚ.

ئەوەڵی نوێژی بەیانی هاوکاتە لەگەڵ تلووعی فەجری سادق تا خۆرکەوتن و ئێستا بە بۆنەی کارەباوە تلووعی فەجرمان بۆ مەعلووم نابیٚ و دونیا ڕۆشنە، ئەوەندە هەیە کە هەروەخت خۆر کەوت یەك سەعات و نیو بەر لەوە تلووعی فەجرە و کاتی نوێژی بەیانی‌یە.

نوێژی بەیانی بوو، پرسم کرد بە مەرحوومی باوکم کە لە دوای خۆر کەوتن ئایا کەی باشە نوێژی چاشتە بکریٚ؟ فەرمووی ١٠ دەقیقە دوای خۆر کەوتن، وەلیٚ دەرەجەی کەماڵی ئەوەتە کە چواریەکیٚ لە ڕۆژ بڕوا، جا بیکەی.

لەبەر ئەوە کە بەرو دوا خستنی نوێژ گوناهی کەبیرەیە و ئینسانی پیٚ فاسق ئەبیٚ و نوێژی لیٚ وەرناگیریٚ، پێویستە کە هەموو موسڵمانان کات و ساتی نوێژەکان بزانن با تووشی گوناهی کەبیرە نەبن و خودا نوێژەکانیان قبووڵ بکات.

حەزرەتﷺ بەیانی ئەو شەوە کە هاتۆ لە میعراج نوێژی بەیانی نەکرد لەبەر ئەوە نەی‌ئەزانی کەی وەختی نوێژی بەیانی‌یەو چۆن ئەکریٚ. بۆ نیوەڕۆ حەزرەتی جوبرەئیل تەشریفی هێناو لە ئەوەڵی وەختەوە نوێژی پێنج فەرزەی بە جەماعەت لەگەڵا کردو بۆ ڕۆژی داهاتوو نوێژی پێنج فەرزەی لە ئاخرین وەختەوە کرد لەگەڵیاو فەرمووی: ئەم بەینە کاتی پێنج فەرزەکەی نوێژی ئێوەیە، بۆ خۆت و بۆ هەموو ئوممەتت.

***

# ڕێ پێوان لە ڕێی خوادا

## کتێبی کەلەپووری کوردی بەشی شەشەم

ڕێ پێوان لە ڕێگەی خوادا چەن جۆرێکی هەیە:

یەکەم: ڕێ پێوانی ساڵە و ساڵە کە واجبە لەسەر کەسانێ کە دەسیان ئەڕوات لە سەراسەری عومریاندا یك جار بڕون بۆ حەج و عومرە کە ئەگەر نزیك بێ بە پێ بڕۆن و ئەگەریش دوور بێ بە وەسیلە بڕۆن.

دووەم: ڕێ پێوانی مانگی‌یە، کە ڕۆیشتنە بۆ نوێژی جێژنی ڕەمەزان لە ئەوەڵی مانگی دوای ڕەمەزان کە پێی ئەڵێن شەوال و ڕۆیشتنە بۆ نوێژی جێژنی قوربان لە دەهەمی مانگی قورباندا، کە پێی ئەڵێن «ژی حجە» و لەو مانگەدا حەج بەڕێوە ئەچێ.

سێهەم: ڕێ پێوانە بۆ نوێژی جومعە لە هەر حەوت ڕۆژا یەك جار.

چوارەم: ڕێ پێوانی واجبە بۆ بەجێ هێنانی نوێژی پێنج فەرز کە تا مومکینە ئەبێ لە مزگەوتا بە جەماعەت بکرێ.

پێنجەم: ڕێ پێوانی واجبە بە شوێن فێر بوونی دین و عیلم و سەنعەتدا.

شەشەم: ڕێ پێوانی واجبە بۆ جیهادو جبهە گرتن بەرانبەر بە هێرشی دوژمنی دینی ئیسلام بۆ سەر ماڵ و نامووسی موسڵمانان و بۆ دفاع تێکۆشێ تا ئەو کافرانە بە تەواوی لەبەین بچن.

جیهاد لەگەڵ نەفس و شەیتانا، جیهادی ئەکبەرە. پێویستە هەموو ئینسانێ لەگەڵ نەفس و شەیتانی خۆیا جبهە گیری بکات کە ڕەفیقی شەوو ڕۆژی ئینسانن. لە منالی‌یەوە هەتاکو جوانی و تا پیری و تا مردن، نەفس و شەیتانی بە تەواوی هەوڵ ئەدەن کە لە هەر وەختێکا بۆیان ڕێ بکەوێ، ئینسان لە خەتی ئیسلام دوور بخەنۆو بیخەن بە ڕێگای فەساداو هەرچی مەسڵەحەتی دین و دنیای وا تێدا نەیکاو قاتی و پاتی کەن لەگەڵ دنیاو ئەهلی دنیاو فەسادا. ئەوان حەز ئەکەن ئینسان فاسدو فەساد کار بکەن و بەرەو گوناهی ببەن و لە ئەنجامدا بەرەو جەهەننەمی بنێرن.

ئینسانێ کە خوا خاسی بۆ بکا، هەوڵ ئەدات بۆ ئەوە کە هەرچی نەفس و شەیتان پێیان خۆشە، وا نەکات و بەردەوام بێ لەسەر موخالەفەیان. ئەگەر ڕایەك خلەتاو بە گوێی کردن فەورەن تۆبە بکات.

هەرکەس هیچکام لەم ڕێ پێوانەیە نەبێ، چۆن بە خۆی ئەڵێ موسوڵمان؟!....

***

# باس و بابەتی جۆر بە جۆر

## کتێبی کەلەپووری کوردی بەشی حەوتەم

دەرخستنی دەردو بەڵای تریاك...
ڕۆژوو دەوای نەخۆشی بەدەنە و باعیس ڕەزای خوایە...
سکاڵای دێهاتی...
سکاڵای منالّە عازەبەکانمان لە کوڕو لە کچ...
سکاڵا بۆ دەربەدەری کوردو ناکۆکی بەینی خۆیان...
نـاسینی هـەورامـی...
موناجاتی مەلا ئەبووبەکری چۆڕی...
دەستووری مردوو بەڕێ کردن بۆ قەبر...

# دەرخستنی دەرد و بەڵای تریاك

ئەوەی کە زەلیل کێشان تریاکە — لە من ئەپرسی، ئیعدامی چاکە

چونکە موفسیدی «فی‌الارض»ن ئەوان — خەڵکی ئاسوودەن بە نەبوون ئەوان

ئەوەی کە هیوام بە تۆیە کاکە — کە تۆم خۆش ئەوێ تەرکی تریاك کە

تریاك تەرکت ئەکا لە خەڵکی — تەرکی کە هەتا پیاوی بە کەڵکی

تریاك کە زۆری لێ سەندی و کەوتی — لە هەردوو دنیا نەحس و بەدبەختی

ڕزقی مناڵت مەدە بە دووکەڵ — خۆت ڕەقۆ مەکە وەك مەشکەی دووکەڵ

مناڵ بە هیوای بەرگ و خۆراکە — مەیدە بە دووکەڵ بۆ ئەوان چاکە

ئەم هەموو پارە بە یەك هەناسە — مەیدە بە تریاك، بۆ ئەوان خاسە

تریاك ئەتکێشێ بۆ لای هیروئین — درت ئەکا تەواو لە دین و ئایین

بۆ بەشەر حەیفە کە وایە لێ بێ — ئاگای لە دین و دنیای خۆی نەبێ

تەرکی ئەو نەکەی، ئەو تەرکت ئەکا — ڕیسوای ناو قەوم و عەشرەتت ئەکا

سیگار کێشانیش، سووکە تریاکە — بایس خەسارو ڕەنج و هیلاکە

دەیسا تووڕی بە هەتا ئەتوانی — جا پیاوی ڕێك و پێك و جوانی

عەقڵ جیاوازی هۆزی ئینسانە — لە دەسی نادا ئەوەی ئینسانە

حەیفە بۆ ئەوەی ئینسان و کوردە — زەلیلی بەردەس تریاك و گەردە

تریاك و حەشیش، گەردو هیروئین — مەرتەبەی بەرزت دێنن بۆ پائین

هەتاکو مردن لە سەر تەرکەکەی — بڕۆی هەر هێشتا زەرەرێ ناکەی

تەرکی کە هەتا بە پێوە ماوی — یا خوا دوژمنیش نەچێتە داوی

هەرکەس بیکوژێ یا تەمای تێ کا — ناتوانێ دیفاع لە نەفسی خۆی کا

شەراب و ئارەق هەر وەك تریاکە — سەبەب نەبوونی و مەرگ و هیلاکە

مناڵ ڕەش و ڕووت بێ نان و ئاوە — ئاغەی تریاکی کەی ئەوە پیاوە

ئەوەی کە لە گیان خۆشەویس‌ترە تەنیا ئابڕووتە، نەك شتی‌ترە
نەخۆشینەکەی واگیرە تریاك نەك تۆ، عالەمێ ئەخاتە هیلاك
حەشیش و گەرد و مەقاش و مەنگەڵ لایبە مەمکوژە بە چەقە دووکەڵ
هەزارو سێسەد کە حەفتاو حەوتە لایبە، تووڕی دە ئەم قوزەڵقۆرتە
ناوم ئەپرسی، میم و عەینێکە ئامادەم کردووە ئەمە بەینێکە

***

# ڕۆژوو دەوای نەخۆشی بەدەنەو هۆی ڕەزامەندی خوایە

بسم‌الله ئاغازو ئەوەڵی کارە
دوایی حەمدو سەنای پەروەردگارە

سەڵات و سەلام بۆ «خیرالانام»
بۆ یارو پەیڕەو تا ڕۆژی قیام

ئێمەیش بەرکەوین، ئەهلی ئیمانین
ئومەتی ڕەسوول ئاخر زەمانین

ئەی قەومو عەشرەت،هۆزی موسوڵمان
ڕۆژووی ڕەمەزان فەرزە لە سەرمان

ڕۆژووی ڕەمەزان فەرزی خودایە
سوننەت و ڕێگای «رسول‌الله» یە

هەڵسن بۆ پارشێو، پارشێو سوننەتە
پارشێو مەخسووسی خێری ئوممەتە

پارشێو کە هێزی دڵە بۆ بەشەر
چاکتر وەهایە بیخەیتە سەحەر

سەحەر شەش یەکی ئاخری شەوە
نوێژو پارشێو کە، تیایا مەخەوە

خەوو ئیسراحەت لە خۆت شێوێنە
ئەم یاسا جوانە بە دەسی بێنە

هەرکەسێ ئاگای برسیەتی زانی
قەدرو حورمەتی نیعمەتی زانی

جا کەوتە تەکبیر فەقیرو هەژار
دەس کا بە بەخشش لەم بارو لەو بار

شوکرو سوپاسی خودا بە باشی
جێ بە جێی ئەکا، نەك وەکو ناشی

ئەوە تەجرەبە ئیسباتی ئەکا
دەرسی مامۆستا ئیسباتی ناکا

تەجرەبە یەکێ لە دەلایلە
بە شك و شوبهەی زۆر کەس زایلە

با ڕۆژوو بگرین گشتمان بە تێکڕا
هات و حەیاتمان ناکاو لێ بڕا

دوا خستنی پارشێو سوننەت و خێرە
دوا خەری پارشێو گورچکی تێرە

تێر بخۆو هەڵسە بۆ نوێژ بەیانی
یاسای ئیسلامت گشت بە جێ هانی

لە تەواو ڕۆژا دەمت ببەسە
لە غەیبەت خەڵك و درۆو دەڵەسە

با ئازای گیانت گشت بە ڕۆژوو بێ
تێکەڵاو گوناه و بێ شەرعی نەبێ

زوانت خەریکی زیکری خودا بێ        زاهیرو مەعنات لەگەڵ ئەوا بێ
عیبادەت گەورە، کردنی کارە        سەرشۆڕ دوو دنیاس ئەوەی بێکارە

***

# سکاڵای دێهاتی

ئامان ئیدارەی کەشاوەرزیمان
گوێ گرن لە شەرحی ماتی و کزیمان

ڕۆژ تا ئێوارە، عارەق ئەڕێژین
کە بە سەربەرزی وڵاتمان بژین

خەریکی کشتی گەنم و جۆ ئەبین
دەس بە داوێنی قووەی خۆ ئەبین

خەریکی کشتی نۆکی لووت لارین
لەبەر مانوویی، لەخۆ بێزارین

خەریکی کشتی وێنجە و شەوەرین
لە زەحمەت باری خۆ بێ خەوەرین

بە ڕۆژ خەریکی جۆگە و جۆ ماڵین
بە شەو تا بەیان لە دەرد ئەناڵین

ئێوەش بێ درێغ کومەکمان ئەکەن
بە ڕەهنمایی کوودمان پێ ئەدەن

جێی کشت و کاڵمان سەمپاشی ئەکەن
دیفاعێکی باش لە ئافەت ئەکەن

حەیفی ئەوەیە کە نیوە کارین
بۆ پوولی تراکتۆر دایم قەرزارین

زووتر نیوەکار بەگ و ئەرباب بووین
مانوو و بێ بەهرەی چوار فەسڵی ساڵ بووین

ئیسە نیوەکار ساحێو تراکتۆر
فزە کەین، فەورەن لێمان ئەکەن تۆر

کە پاییز دەسکەوت لە یەك ئەدەینۆ
بە قەی تراکتۆر بەهرە نابەینۆ

دەوڵەتیش ئەڵێ ئالاتی کشتی
بۆ ڕەفاو خۆشی فەلایە گشتی

تراکتۆر ڕەفای دەوڵەمەنانە
خەفەتی سەنگینی دڵ فەقیرانە

ئێوە لۆتفێ کەن لەگەڵ فەقیران
قیمەت دیاری کەن بۆ تراکتۆران

ئیعلامی بکەن قیمەت سەعاتی
تا خەبەردار بن ئەهلی دێهاتی

زیاد نەسێنن لە خەڵکی هەژار
هەر ساتێ ڕازی نابن بە هەزار

خەڵکی دێهاتی لە داخ تراکتۆر
ڕۆین بۆ شارو لە دێ کردیان تۆر

ئەم تاقە تاقە لە دێدا ماوە
لەبەر کەم دەسی لە دێ جێماوە

فریا نەکەون ئەمانیش ئەڕۆن
لە داخ قەرزاری و بێ برنجی و ڕۆن

هەر بە تەبلیغات ڕەفای کەشاوەرز
هیچ پەیا نابێ قەرزارن هەر وەرز

خەریك دانان و كاری تووتنین
بە شادی و خۆشی زۆرو پێكەنین

خەریكی سەوزی كاری و بیستانین
زەحمەتمان زۆرە و زۆر هەراسانین

لەگەڵ فەلایی خەریك حەیوانین
خزمەتیان ئەكەین هەتا ئەتوانین

لە دوای تراكتۆر چی ئەمێنێتۆ
دوكتۆرو دەرمان ئەویش ئەباتۆ

موشكلاتی دێ بەیان كەم بۆتان
هەتا حەلی كەن بە فیكری خۆتان

یەكێ لەوانە خەرج تراكتۆرە
گرانە بۆمان نابێ بەم جۆرە

دووەم دوكتۆرو دەرمان و دەرزی
دەسمان پێ ناگا بە قیمەت بەرزی

بۆمان ئاسان كەن ئەم دوو موشكلە
وەزیفەی ئێوە حەللی موشكلە

سێ، تەعاوەنی دابنێن بۆمان
لە هەموو دێیەك شت بێنێ بۆمان

لە شارا هەرزان شتمان بۆ بێنێ
بە قیمەتی رۆژ شتمان لێ سێنێ

هەتاكو شاری، شتمان بە گران..
پێ نەفرۆشێ، ئامان سەد ئامان

هەرچیكمان هەیە بە هەرزان بیبا
غارەتمان نەكا بێ قیمەت نەیبا

چوارەم موشكلات كارتی «بیمە»یە
كە بەو هەمیشە ئیحتیاجمان هەیە

ئێمەیش كاریگەر ژێری پۆششین
ئارەق ئەرێژین، هەر تێ ئەكۆشین

پێنجەم موشكلات نەبوون ماشینە
كە دەردی گەورەی رووی سەرزەمینە

ماشین سەهمیە بۆمان بنێرن
هەریەكی دێیەك بەوان بسپێرن

قیرتاوی بكەن جادەی دێهاتی
لە خەم و ماتی بیدەن نەجاتی

رەفای دێهاتی خەڵكی بەن ئەكا
لە كۆچ كردنی بۆ شار مەنع ئەكا

خۆشی بسەر زەوی تەنیا دێهاتە
بەو شەرتە لاچێ ئەم موشكلاتە

وا دەردە دڵم بەیان كرد بۆتان
ئێوەش خۆتان و غیرەتی خۆتان

هەزارو سێسەدوحەفتاو حەوت شەمسی
هەژدەی خەزەڵوەر، ئەم شیعرەم نووسی

ئەگەر ئەپرسی ناوو نیشانم
خەڵكی سەر زەوی و ژێر ئاسمانم

***

# سکاڵای مناڵە عازەبەکانمان لە کوڕو لە کچ

## بۆ لای باوك و دایك کە زوو هاوسەریان بۆ پەیا بکەن

برای موسوڵمان گوێ بگرە بۆمان — بە دەستووری شەرع عەلاج کەین خۆمان
کوڕمان و کچمان وەختێ پێ گەیین — لە ژن و شوویی نەختێ تێ گەیین
کوڕمان زوو بە زوو ژنی بۆ بێنین — دەستووری شەرعی بۆ بەجێ بێنین
با نەڕوا بە شوێن ژن و خەیاڵا — ئابڕووی نەڕوا لە ماڵەو ماڵا
کچمان هەر وەکو کوڕمان عەزیزە — با بیدەین بە شوو هەتا لەزیزە
بیانوو نەگێڕین بە زاوا بۆ ماڵ — بۆ قەرزو قۆڵە نەچێ ماڵەو ماڵ
تالانی بکەین جا ژنی بەینێ — سەرشۆڕی ئەکەین هەتاکو بەیێ
چۆن تێ ئەکۆشی بۆ کوڕو بۆ بووك — وا نەکەی، بۆ کچ خۆت ئەکەی چرووك
گەزو گیف مەکە مەڵێ هاتمە — کچ من باشترە لە حەزرەت فاتمە
ئەو حەددی چیە وەك فاتمە وابێ — ئەگەر وەك مانگی درەخشان وابێ
ئەگەر گوێ ناگری بۆ من، وەك ئەوسا — گوێ بە بە دەستوور دیوان مامۆستا
هەشت شیعری نووسی بۆ ئەم مەبەسە — تۆ بیگرە لە گوێ، هەر ئەوتە بەسە
ئەولادی خراپ هەر وەکو مارە — زوو بە زوو بیکەین دەرمان و چارە
نەیەڵێن بڕواو بڕوات بە خەتا — عەلاجی ناکەی، کە کەوت بە خەتا
غەریق لە دیوان خۆی وای وتووە — زەماوەن فاتمە بەم جۆرە بووە
وەختێ کە حەزرەت ڕەسوولی ئەکبەر — بە بووکی فاتمەی نارد بۆ ماڵ حەیدەر
فەرمووی: بووبەکرو عومەرو عوسمان — لەگەڵ ئوسامە «علیهم رضوان»
برازاوا بن، بڕۆن لە تەکی — هەڵگرن بۆ ئەو هەموو پێ تەکی
دەسارو گۆزە و گڵێنە و سەرین — ئەمما پڕ لە پووش، ژێرەخەو چەرمین
ئەمە پێتەك بوو، هەڵیان گرت و ڕۆین — هەڵیان گرت بردیان بە گریان و شین

وتیان پێتەکی فاتمە ئەمەیە
کافران هەزاران دیناریان هەیە

حەزرەتیش فەرمووی ئەمە زۆر زۆرە
لەمە زیاتر سەبەب غوورە

سەڵات و سەلام لەسەر هەموویان
ئەمە کافییە بۆ ئەهلی ئیمان

***

# سکاڵا بۆ دەربەدەری کوردو ناکۆکی بەینی خۆیان

هەر وەکو مەنجەڵ دڵم هاتە کوڵ ‌ ‌ ‌ بە ئاوی نووسین ئەیکەم کەف و کوڵ
بۆ کوردی هەژار دایم ئاوارە ‌ ‌ ‌ لە بۆ بێگانە دایم ژێر بارە
ئیختیاری خۆی داوە بە دوژمن ‌ ‌ ‌ برای خۆی ئەکوژێ هەر وەکو دوژمن
برام، وا نابێ مەبە بە نۆکەر ‌ ‌ ‌ سینەت بۆ دوژمن مەکە بە سپەر
براو دراوسێو ڕەفیقی چەند ساڵ ‌ ‌ ‌ مەیکە بە کافر، مەیکوژە وەك داڵ
خۆت موسوڵمانی، دەسگیری خەڵکی ‌ ‌ ‌ هەڵگری باری گرانی خەڵکی
کافر بە نەسسی سەریحی قورئان ‌ ‌ ‌ دوژمنە لە بۆ هۆزی موسوڵمان
تۆیش ئەگەر کوردی و ئەر موسڵمانی ‌ ‌ ‌ دوژمنی سەرسەخت هۆزی ئەوانی
قانوونی ئەوان مەگرە بە دەسۆ ‌ ‌ ‌ مەبە بە پەڕۆو مەبە بە بۆسۆ
قورئان قانوون و یاسای ئیسلامە ‌ ‌ ‌ ئیمامی هۆزو بەرەی ئیسلامە
ئەگەر دەس‌گیری شەرقی یا غەربی ‌ ‌ ‌ هەمیشە خەریك بەدبەختی و حەربی
ئەگەر دەس‌گیری حوکمی قورئانی ‌ ‌ ‌ سەربەرزی دنیاو ئاخر زەمانی
ئەڵێن هەڵگرتن چەك و ئەسڵەحە ‌ ‌ ‌ من کە دۆسی تۆم بۆ تۆ ئەسڵەحە
کوردو دراوسێ خۆتی پێ کوژێ ‌ ‌ ‌ کافر بە شادی و بە خۆشی ئەژێ
هەر موسوڵمانێ کە کوژیا بۆیان ‌ ‌ ‌ سەربەرزی تەواو دنیایە بۆیان
مزگەوتی ئیسلام جێگەی تەقدیسە ‌ ‌ ‌ جێی عیبادەت و فتواو تەدریسە
مەیکە بە جێگەی فتوای ناحەقی ‌ ‌ ‌ ئەگەر پەیڕەوی ڕێگەکەی حەقی
مەیکە بە جێگەی ئەسڵەحە و ئەنبار ‌ ‌ ‌ تیا هەڵمەچنە تایە بە خەروار
بڵەندگۆ ڕۆشن مەکە بۆ وتار ‌ ‌ ‌ مەگەر بۆ ئەمری خودای کردگار
یا بۆ بانگ کردن خەڵکی بۆ نوێژان ‌ ‌ ‌ لە بۆ پێنج فەرزە لە شەوو ڕۆژان
بەخوا هەتاکو ماوم لە دنیا ‌ ‌ ‌ دڵسۆزی کوردم بۆ هەر دوو دنیا

هەتا بە هۆش و بە ئیختیارم — دژی دوژمنی کوردی هەژارم
بگرن لە گوێتان ئەم نەسیحەتە — وەزیفەی ئیسلام سەمع و تاعەتە
کافرانی زوو، دوژمنانی دوون — «فَرّق تَسُد»یان کردووە بە قانوون
واتە یەکیەتی لابەن لە بەینا — خۆت کە بە ئاغە، بێخەم لەو بەینا
با ئێمەیش لە داخ ئەوان بە ڕاسی — دەسگرین بە یەك بۆ ڕێگە ڕاسی
باپیرمان لە پشت تەفسیری قورئان — نووسیویە باسی بەدبەختی کوردان
چۆن ئاوارە بوون، چۆن بوو گرانی — چۆن بێ تفاقی و چۆن بوو بێ نانی
نووسیویە: کوردان زوویش هەر وەها بوون — بۆ نان و تفاق هەروا داما بوون
دووسەد ساڵ ئەبێ ئەمە نووسراوە — بێ تفاقی و نان هەر وەها ماوە
ڕیشەی ئەم کارە ئەبێ دوزینۆ — تا عەلاجێکی لەبۆ دۆزینۆ
کوردی بێچارە زۆر خۆش باوەڕە — بۆیە بێگانە بۆ ئەوان دڕە
بە درۆی زۆرو بە زووان بازی — بە مەیلی خۆیان ئەیخەنە بازی
تا مەرام خۆیان بەوان جۆر ئەکەن — هەتا ئەتوانن درۆی زۆر ئەکەن
بۆ سەربەخۆیی و حوکمی ئازادی — دڵیان پڕ ئەکەن لە خۆشی و شادی
کەچی مەرامیان بەجێ هات بۆیان — کورد وەکو جاران ئەشێوێ لێیان
ئەیان ساونۆ بە لەقە و بە پا — تا یەکێ تریان بۆ ئەکەن بەرپا
ئەویش تا بەینێ بۆ مەرامی خۆی — درۆی زۆر ئەکا بە قازانجی خۆی
کوردیش دوبارە بۆی دێتە سەما — داگیر ناکرێ لە ئەرزو سەما
ئەویش تا مەرام خۆی دەس بکەوێ — هیچ خەمی نیە کورد سەر ناکەوێ
ئەم دەساودەسە بە کوردی ئەکەن — یاخوا دوژمنیش وایە پێ نەکەن
هەزارو چوارسەد چواردەی قەمەری — بیست و هەشت ڕەجەب، نووسی نووسەری
ڕیشەی ئەم کارە زۆرتر خیلافە — نیفاق و جەهل و درۆو گەزافە

***

# ناسینی هەورامی

بۆت بەیان ئەکەم هەورامی ناسی     باش گوێم بۆ بگرە بۆ دەنگ و باسی

ئەگەر ئەزانی هەورامیش کوردن     زۆر بە سەلیقە و بە دەس و بردن

بڕوانە کلاش هەورامی چۆنە     نەیانگۆڕیوە ئەو ڕەسمی کۆنە

کلاش هەورامی باشتر پێلاوە     ئەو دەقی زووبە هەر نەشێواوە

شاڵی هەورامی لە فاسۆن لەندەن     باشترە لەبۆ سیحەتی بەدەن

بۆ سووك و سۆڵی و بۆ بەردەوامی     کەسێ نەیدیوە وەك شاڵ هەورامی

بە قەناعەت و دەسکردی خۆیان     تەواو دنیایان بردووە بۆ خۆیان

دووکانی پەرداخ یا ماڵی بەرزە     هی هەورامییە لەسەر ئەم عەرزە

نەوەدو نۆیە پیری هەورامان     چاوتان لێمان بێ، ئامان سەد ئامان

هەر مەقامێك و پۆسێ حەساسە     لایەق ئەوانە و بۆ ئەوان خاسە

خاکی هەورامان گشتی هەر گەنجە     خەڵکی خەریکی زەحمەت و ڕەنجە

خۆزگەم بەو ڕۆژە کەسێ پەیا بێ     گەنجی هەورامان بۆی بەرمەلا بێ

ژنیان لە ماڵۆ قەناعەت ئەکا     پیاویان لە دەرۆ کەسابەت ئەکا

***

### بۆ بەرەکەت، موناجات و پاڕانەوەی

## مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی

### ئەنووسم

یا شا سپردم، یا شا سپردم     یا شا ئیمان وەتۆ سپردم
ئامام ئاسانەت بە ڕەنگی زەردم     تۆبەی نەسووحی بە ئیخلاس کەردم
بکەری قەبووڵ تۆبەی نەسووحیم     ببەخشی گونام، یا ڕەب، یا ڕەحیم
ئەوەڵ گیان کێشان وەنەم ئاسان کەی     دووەم دەرەجەم چەنی خاسان کەی
سێیەم کە منیان منوە قەبری تەنگ     مازە فشارۆم قەبری سیا سەنگ
چوارەم تەڵقینم وزەوە جە بیر     پێم دەرۆ جواب مونکەرو نەکیر
پێنجەم کەرەم کەر، قەبرم نەفشارۆ     قەترەیێ ڕەحمەت بە قەبرم وارۆ
شەشەم ئا ڕوە هورمێزۆ مەحشەر     بابە جە فەرزەند نەدارۆ خەبەر
هوشت پیمۆ بێ نەکەوم لەوێ     هەتا هەتایە پەکم نەکەوێ
حەوتەم کە منیان ترازوو میزان     تا تا، موو بە موو، داستان بە داستان
هەشتەم حیساب کەی حەسابەن یەسیر     ببەخشە گونام، یا شای بێ نەزیر
نۆهەم بسپاری من وە جبرەئیل     جە پردی سیڕات پەیم بۆوە دەلیل
دەهەم دەلیل بۆ بگێرە دەستم     مەبادا دۆزەخ بکەرۆ قەستم
یازدە وە ڕوتبەی «اعلي علّيين»     چەنی خاسانت کەرەم هام نشین
گەر بە لوتفی ویێت ببەخشی حەسەن     حەسانات مەبۆ حەسەن هەی حەسەن

***

# دەستووری بەڕێ کردنی مردوو بۆ قەبر

ئەم دەسە شیعرە لێرا نووسراوە — عینوانە لە بۆ ئەوە نووسراوە
یاسینی زینوو، تەڵقینی مردوو — قەت تەرکی نەکەن سونەتن هەردوو
چوار شت کە فەرزە بۆ مردوو بیکەن — ئەبێ بە تەرتیب بەم جۆرە بیکەن
شۆردن و کفن و نوێژ کردنی — بە خاکی پاکی تەسلیم کردنی
کفن، داپۆشین لاشەی مردووە — تەماشای نەکا ئەوەی زیندووە
بەکراسێ کفن فەرزە ئیتر بەس — ئیسراف حەرامە بۆ هەواو هەوەس
حەوت شت کە فەرزی نوێژی مردووە — بە تەرتیبی شەرع بەم جۆرە بووە
نیەت و سەلام، وەکو نوێژەکان — بە پاوە وێستان لە بۆ ڕوکنەکان
چوارەم، چوار کەڕەت «الله اکبر» — فاتیحا خوێندن دوای ئەوڵ یەکسەر
دوای دووهەم، سەڵوات لەسەر پێغەمبەر — دوای سێهەم، دۆعا بۆ مردووەکە بەر
دۆعا بۆ مردوو شەفاعەتیەسی — خوا قەبوولی کا ئیتر بەسیەسی
دۆعا بۆ مردوو قەت تەرکی نەکەی — خوا قەبوولی ئەکا هەرجۆر کە بیکەی
«اَللّٰهُمَّ اغفِر لَه وَ ارحَمهُ» — کەفایەت ئەکا بۆ نوێژی مردوو
سێ سەف جەماعەت ئەم نوێژە بکات — زۆرتر نزیکە خوا قەبوولی کات

***

# پرسەیش بەم جۆرە شەرعییە

سەرخۆشی بکە لە پاشماوەکان — تا سێ ڕۆژ ڕێکەوت «بِأَیِّ مَکان»
لە پاش سێ ڕۆژە ئیتر بیدعەتە — واتە موخالیف یاساو سونەتە
وەك مەجلیس گرتن بۆ هاتن خەڵكی — ڕیایە بۆ دین هیچ نیە کەڵکی

خـۆراکـیان بەنیٚ خـۆراکـیـان مـەخۆن　　داخیان پیٚ مەدەن، خەمیان بـۆ بخۆن

## دادە لـەگـەڵ تۆمـە

بـیٚ ئیـزنی شـووەکەت مەڕۆ بۆ پرسـە　　لە قـەهـرو غـەزەب خـودا بـترسـە

کـەسـیٚ نـایـنـاسـی مـەڕۆ بـۆ پـرسـە　　کە ناچاری بـیٚ، یـەك کەڕەت بەسە

***

# سکاڵا

## بۆ بەدحاڵی ‹ مەلا ›

### لە ساڵی ١٣٤٤هەتاوی

بـرا بیـن و بـە گشـتـمان تـەگبـیـرێ کـەین بۆ مەلا
دەری بێـنـین لـــە ژێـر مـنـەتـی ئـاغـا و فــەلا

بـڕوا ئـیـشـێ کـا بـۆ خـۆی، بـژی بـە بێ مەمنوونی
تاکو دەس بـەردار نـەبێ لە شێـتی و لە مەفتوونی

فــەلا ئــەڵــێ ئــەم مــەلا ڕزدەســەکی ئـاغـایـە
دایـم مەیـلی دڵی ئـەو لـە جـەنـجـاڵ و غـەوغایە

ئـاغـا ئـەڵـێ ئـەم مـەلا قـازانـجی خـۆیی ئـەوێ
خەفەت بۆ هیچکەس‌ناخوات سەرکەوێ یا ژێر کـەوێ

دەروێـش ئـەڵێ ئـەم مـەلا مـۆنـکـیر مـەشـایـخـانە
بـڕوای نـیـە بـە مــارو بــەرد خــواردنی دێـوانـە

سـۆفی ئـەڵـێ ئـەو کـەشـف و کـەڕامـەتـە ئـەیزانـم
مـەلا نـاچـێ بــە لایـا بـۆیـە مـۆنـکـیر ئـەوانـم

شـێـخـان ئـەڵـێـن ئـەم مـەلا کـە نـابـێ بە خەلیفە
با لـە شـەرعـا زانـا بـێ لـە دەروونـۆ کـەسـیــفـە

مـەئـمـوور ئـەڵێ ئـەم مـەلا عـیـلـمی جـەدیـد نازانێ
بابـەتـی ئـێـمـە نـیـە ئـەو عـیـلـمـە ئـەو ئـەیـزانێ

خـوای گـەورە لـە مـەلا تـەبـلـیـغی دیـنـی ئـەوێ
چـش نان و بەرگی نـیە و تاوێ بێ خـەم نـاسرەوێ

ژن و مـنـاڵ و مـیــوان ســەربـاری خــەم مـەلایـە

بۆیــە پـەرێـشـــان حـــاڵ و دامـــاوو کـەلـەلایــە
مـەلاژن و مـنـالـی زەردو ســـووریـان لـێ ئـــەوێ
قـالێ و دۆشەکە و لێـفە و خۆراکی خۆشیان ئەوێ
دەیسا مـەلای بێـچـارە چـۆن خـەوی لـێ ئەکـەوێ
بێ کـەسـب و بـێ دەسـمـایـە ئەمیـانە لە تـۆ ئەوێ
لـە دنـیـای «أَيْـــنَ الْـمَــفَـــرُّ» وا کـــراوە لــە مـــەلا
هـیچی لە بیـر نـەمـاوە، نـاوی خـۆیـشـی مـەسەلا
مـن دەردو خـەمـم زۆرە، سـکـالاّم کـرد بـەم جـۆرە
من دەورەم تەواو بـووە، کـەوتـە لای ئـێـوە نـۆرە
مـەلا پێـویـسـتی خـەڵـکە، زۆر بـاش و زۆر بە کەڵکە
فەوتان ئەوان بـە حەتمی، فـەوتـان تـەواوی خـەڵکە
خـزمـەتـیـان کـەن تـا مـاون، زۆر هـەژارو دامـاون
ژیـنتـان بـێ مـەلا شـیـنـە، سەرشـۆڕو لـێ قەوماون

***

لە دێی «نەچێ» دا لە ساڵی ١٣٤٤ی شەمسی بۆ سپا دانشێ فەقێکانیان لە حوجرە دەر کردو منیش دەردە دڵم بەم جۆرە دەربڕی.

سـپا دانـش لە حـوجرە دەرس ئـەڵێتۆ
خـەریـکی فـیـکـەیـە تـا لێ ئـەبێـتۆ
هەمـوو لایـەك وەهـــایە نــەك ولاّتـــێ
دەسا خۆزگە لە بۆ مەرگ و وەفاتێ
فـەقـێ و حـوجرە و مەلا بـاوی نـەماوە
مـەحـەببەتیان لە دڵ خەڵکا نەماوە

***